سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
بەختیار حەمەسوور

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٢٥٠٠

ناونیشان
سلێمانی- شاڕێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.sardem.org

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

سەرۆکی فەخری

شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا

ئازاد بەرزنجی



# پێرست



# ژیاننامەی عەزیز گەردی

عەزیز ئەحمەد عەبدوڵڵا ناسراو بە عەزیز گەردی (١٩٤٨ لە بەحرکە، هەولێر – ٦ی حوزەیرانی ٢٠٢٢ لە هەولێر) نووسەر و وەرگێڕێکی کورد. قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی هەر لە بەحرکە تەواو کردووە. عەزیز گەردی زۆر شاکاری جیهانی بۆ سەر زمانی کوردی  وەرگێڕاوە. ئەو بڕوانامانەی کە لە ژیانیدا بەدەستیهێناون بریتین لە: بەکالۆریۆس لە بەشی زمانی فەڕەنسی زانکۆی مووسڵ، ماستەر لە ئەدەبی کوردی لە ساڵی ١٩٩٤ و دکتۆرا لە ئەدەبی کوردی لە ساڵی ١٩٩٩. بڕوانامەی دکتۆرای دووەمی لە کۆلێژی زمان لە زانکۆی کۆیە لە ساڵی ٢٠٠٩ بەدەستهێناوە.

عەزیز گەردی جگە لە فەڕەنسی، زمانەکانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی لەگەڵ دیالێکتە جیاوازەکانی کوردی زانیوە. کۆمەڵێک شاکاری ئەدەبیی جیهانی وەرگێڕاوە لەوانە: داغستانی من، کۆمیدیای یەزدانی، بەرهەمەکانی تۆلستۆی و ئۆریانا فالاچی و... وەرگێڕاوە.

ڕۆژی ٦ی حوزەیرانی ٢٠٢٢، عەزیز گەردی لە شاری هەولێر بەهۆی سستبوونی گورچیلە کۆچی دوایی کرد.




**کارنامەی ڕۆشنبیریی و ئەکادیمی:**

- لە ساڵی ١٩٧٠وە ئەندامی یەکێتیی نووسەرانی کوردە.
- لە ساڵی ١٩٧٦ ئەندامی ڕۆژنامەنووسانی عێراق بووە.
- لە ساڵی ١٩٨٤ ئەندامی کۆمەڵەی وەرگێڕان بووە.
- لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین مامۆستا بووە.
- سەرپەرشتی و ئەندامی هەڵسەنگاندنی چەندان نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای کردووە.
- پلەی زانستی پرۆفیسۆرە.























**بەشێك لە بەرهەمەكانی:**

ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، هەولێر، ١٩٧٢.

- ئەدەب و ڕەخنە، بەغداد، ١٩٧٤.
- ئەدەبی بێگانان، بەغداد، ١٩٨٢.
- جووتیارێکی زیرەک.
- پیاوێک.
- سەروا، هەولێر، ١٩٩٩.
- کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی، هەولێر: وەزارەتی ڕۆشەنبیری، ١٩٩٩.
- ڕەوانبێژی (ڕوونبێژی، جوانکاری، واتاناسی)، وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٢.
- ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- گەردەلوولی مەرگ، هەولێر، ٢٠٠٨.
- کێشناسیی کوردی، ٢٠١٤.
- سێ دەرمان: هەقایەتی کوردەواری، کۆکردنەوەی عەزیز گەردی.

**وەرگێڕان:**

- چیرۆکی بەر ئاگردان.
- چیرۆکەکانی ئیزۆپ، یان لەناو گیانداران دا، نووسینی ئیزۆپ.
- لۆرکا: سێ تراژیدی.
- سێ نیگار.
- قورینگ.
- هونەری شیعر.
- لەگەڵ منداڵانی گوندەکەمان.
- گێلەکانی چێلم و مێژوویان.
- یەزداندوخت.
- نامەیەک لە پەکینەوە.
- (چرا)یەک لەسەر مادیان کۆ، نووسینی مەنسوور یاقووتی.
- بیرەوەرییەکانی مامۆستایەک، نووسینی مەنسوور یاقووتی.
- لاوەچ، نووسینی مەنسوور یاقووتی.
- ئێمە ئەم شیعرەمان نوسیوە.
- ئەفسانەی ئەرمەنی، نووسینی چارلز دونیتگ.
- ئەفسانەی ئەفریقی.
- ئەفسانەی سلاڤی.
- ئەفسانەی کوردی، نووسینی م ب ڕودێنکۆ.
- ئەفسانەی تورکیایی.
- بەرکوتێکی ژیانم، نووسینی یەڤجینی یەڤتوشینکۆ.
- ئافرەت ڕەگەزی بێکەڵک، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- پەنەلۆپە لە جەنگدا، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- پیاوێک، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- حەفت گفتوگۆ، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- ژیان و جەنگ و هیچی تر، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- گفتوگۆ لەگەڵ مێژوودا، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- نامەیەک بۆ ئەو کۆرپەلە نێرینەی کە هەرگیز لەدایک نەبوو، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- ئەگەر خۆر بمرێت، نووسینی ئۆریانا فالاچی.
- چیرۆکەکانی کریلۆڤ.
- حاجی مراد، نووسینی تۆلستۆی.
- خەڵک بە چی دەژی، تۆلستۆی.
- خوا و شەیتان.
- کاریگەریی گۆرانی لەسەر کوردیی ناوەڕاست.
- درەختی چل داستان، لە نووسینی کەلیمولَلا تەوەحودی.
- داستانی حوسێنی کورد و چەند هەقایەتێکی تر، لەفارسییەوە لەنووسینی ئەحمەد ئازەر ئەفشار.
- زارا عەشقی شوان، نووسینی محەممەد قازی، سلێمانی.
- ڕۆمیۆ و جوولێت.
- یەک چیای گەوهەر: کۆمەڵەچیرۆکێکی

ئەفسانەیی گەلان.

- کۆمیدیا، سێ بەرگ: دۆزەخ، بەرزەک، بەهەشت، نووسینی دانتێ ئەلیگیێری.
- داغستانی من.
- قۆڵبر، نووسینی عەزیز نەسین.
- قوتیل، نووسینی ئەلفۆنیس دۆدی.
- ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد.
- کچەی فەرماندە.
- مەسەلەک، هێنری ئەلیک.

**مردن:**

عەزیز گەردی گرێیەکی شیرپەنجە لە گورچیلەیدا هەبوو، بەو هۆیەوە مانگی ئازاری ساڵی ٢٠٢٢ نەشتەرگەرییەکی بۆ ئەنجامدراوە و دواتر دۆخی تەندروستی باش بووەتەوە. بە هۆی سستبوونی گورچیلەکانییەوە، عەزیز گەردی چووەتە دەرەوەی وڵات، لەوێ دوای چارەسەر یەکێک لە گورچیلەکانی بۆ دەردەهێنن و دوای گەڕانەوەی بۆ هەولێر بە چەند ڕۆژێک، تاکە گورچیلەکەی دیکەی تووشی ئازار دەبێت. دووبارە ڕەوانەی نەخۆشخانەی تایبەتیی ژین، لە شاری هەولێر کراوەتەوە. گەردی لە بەیانی ڕۆژی دووشەممە ٦ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٢٢، لە نەخۆشخانەی تایبەتیی ژین کۆچی دوایی کرد.

*ئامادەکراو لە چەند سەرچاوەیەکەوە.

























# ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد

ئازاد بەرزنجی

هەبوو... نەبوو، پیاوێک هەبوو بڕیاری دابوو هەموو ژیانی خۆی بۆ تاقە مەعشووقێک تەرخان بکات، بڕیاری دابوو لەپێناوی ئەو مەعشووقەدا، قوربانی بە هەموو شتەکانی تری ژیانی خۆی بدات، چونکە هەستی دەکرد تاقە هاوژینێکە بتوانێ تا سەر لەگەڵیدا هەڵبکات و ئەمەکدار بێت بۆی؛ تاقە دڵبەرێکە شایانی ئەو ئەڤینە قووڵەی بێت، ئەو دڵبەرەش چ نەبوو جگە لە "پەیڤ"، بۆیە ئەم عاشقەمان تەنیایی لەگەڵ پەیڤدا هەڵبژارد و دەشیزانی ڕێی عاشقی سەختە و ئەو سەوداسەرییەش چەرمەسەریی زۆری بەدواوەیە و عاشقانیش هەمیشە تەنیا دەمێننەوە.

سەرەتای هەشتاکان بوو، تازەلاو بووم، وەختێ "داغستانی من"ی هەمزاتۆڤم بە زمانە ئەفسووناوییەکەی ئەو پیاوە ئەڤیندارە خوێندەوە، نایشارمەوە گەر بڵێم سەرسامیم بەو زمانە سیحرییەی مامۆستای جاویدان "عەزیز گەردی"، یەکێک بووە لەو هۆکارانەی وای لێ کردووم شەیدای دونیای وەرگێڕان بم. خودایا، ئەوە شیعرە بە زمانی پەخشان نووسراوە، یان پەخشانە ـ بەرگی شیعری پۆشیوە؟! هەر ئەو کتێبەی وای لێ کردم بۆ لەوەودوا بەدووی کتێبەکانی تریدا بچم و ـوای ئەوە سێ شاکاری "لۆرکا" بە وەرگێڕانی ئەو خوێنمەوە، کە بریتی بوون لە سێ شانۆنامە و پاشان ڵاوکراوەیەکی وەرزی بە ناوی "ئەدەبی بێگانان".

ـەڵبەتە من ئەو دەمانە بەبێ ئەوەی لە نزیکەوە ئەو یاوە بناسم و بیبینم، بەردەوام بە دوای کارەکانیدا ـەچووم.

ـۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیی، لە سەرەتای هەزارەی ـووەمدا بوو، ئەو کاتە دوو سێ ساڵێک دەبوو ـەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دامەزرابوو و لە ـانوویەکدا بووین لای فولکەیەکەوە، کە ئەوکات پێیان ـەوت فولکەی یەکگرتن و وەک ئێستا سەرپەرشتیاری ـنجیرە کتێبەکانی دەزگای سەردەم بووم. ڕۆژێکیان ـە هەر خۆم بووم لە ژوورەکەمدا و خەریکی کار ـووم، لە دەرگای ژوورەکەم درا و منیش فەرمووم ـرد، دەرگاکە کرایەوە و پیاوێکی کەڵەگەت بە ـلوبەرگی کوردییەوە دەرکەوت و گوتی ئەمە ژووری

کاک ئازاد بەرزنجییە؟ منیش وتم بەڵێ فەرموون. گوتی ڕوخسەت هەیە بێمە ژوورەوە، وەڵامم دایەوە: بێگومان، فەرموون. گوتی خۆتان کاک ئازادن؟ گوتم بەڵێ، فەرموون. گوتی من عەزیز گەردیم. کە وای گوت، نایشارمەوە حەپەسام. یەکەم لە ڕووی خۆشحاڵیمەوە بە بینینی و بە سەردانەکەی، دووەمیش ئەوەی من بۆی نەدەچووم ئەوە بوو کە ئەو پیاوە عەزیز گەردی بێت، نازانم بۆچی ئەوم بە پیاوێکی چاکەت و پانتۆڵ لەپێ تەسەوور دەکرد؟ لێ کە وای وت، زۆر بە گەرموگوڕییەوە بەخێرهاتنیم کرد و گوتم سەرچاومان هاتیت مامۆستا عەزیز، فەرموون دانیشن. ئینجا کە دانیشت و داوای چایەکم بۆ کرد، یەکسەر باسی ئەوەم بۆ کرد کە کاتی خۆی وەرگێڕانی "داغستانی من"، بە زمانە پاراو و پڕئەفسوونەکەی ئەو، چ کاریگەرییەکی لەسەرم هەبووە. دواتر گوتم ئێمە هەموو لە ڕووی عیشقی وەرگێڕان و زمانە جادووییەکەی ئێوەوە، قەرزاری قەڵەمە بەبرشتەکەی جەنابتانین. گوتی کاک ئازاد ئێمە شتێکی گەورەمان نەکردووە و ئەوەی کردووشمانە ئەرکی سەرشانمان بووە. پاشان گوتی یەک دوو کتێبم لەسەر ئەفسانەی گەلان هێناوە و پێم خۆشە لە سەردەم چاپ ببن. منیش گوتم سەردەم شانازی بەوەوە دەکات کتێبی جەنابتان چاپ بکات و دواتر هەردوو کتێبەکەمان بۆ چاپ کرد. لە ساڵانی دواتردا و وەختێ چووینە تەلارە تازەکەی دەزگای سەردەمەوە لەسەر شەقامی سالم، لە سەردانێکیدا بۆ لام، باسی ئەوەم بۆ کرد کە کۆمەڵێک کتێبمان هەڵبژاردووە بۆ وەرگێڕان و یەکێک لەو کتێبانە "کۆمیدیای یەزدانی"ی دانتێیە و پێشنیازی ئەوەم بۆ کرد کە ئەگەر لوتف بفەرمووێت، ئێمە شاناز دەبین بەوەوەی بەڕێزیان ئەو کتێبەمان بۆ وەربگێڕێت. جەنابی پێشنیازەکەمی پەسەند کرد و دوای ساڵ و نیوێک یان زیاتر بە دەقە کوردییەکەی "کۆمیدیای یەزدانی"یەوە هاتەوە بۆ لام و سێ



دییەکەی دامێ و وتی فەرموون ئەوە کتێبەکە. منیش بەو هەواڵە شاگەشکە بووم و بەڵێنم پێ دا کە بە زووترین کات بۆی چاپ بکەین، ئیتر ئەوە بوو لە سێ بەرگدا و لە بۆکسێکدا بۆمان بە چاپ گەیاند و زۆر پێی دڵخۆش بوو.

ساڵی ٢٠١٤ بوو، وەکو دەزگای سەردەم بڕیارمان دابوو ساڵانە دوو خەڵات بە ناوی شاعیری گەورە 'شێرکۆ بێکەس'ەوە بدەین بە دوو داهێنەری دونیای ئەدەبی و فیکریمان. من پێشنیازی 'بەختیار عەلی' و 'عەزیز گەردی'م کرد و هەر بەو مەبەستە ڕامانگەیاند کە سەردەم بۆنەیەکی ڕێزلێنانی وەهای بەدەستەوەیە. بەڵام دوای ئەوەی مامۆستا گەردی هەواڵەکەی خوێندبووەوە، یەکسەر تەلەفۆنی بۆ کردم و پاش چاکوچۆنی، گوتی کاک ئازاد ئەگەر منت خۆشدەوێ و دەتەوێ بێتاقەت نەبم، ناوی من بۆ ئەو خەڵاتە بسڕەوە.

گوتم مامۆستا ئەو خەڵاتە لەچاو گەورەیی قەڵەمی تۆ و بەخششەکانتدا هیچ نییە، گوتی من حەز بە هیچ خەڵاتێک ناکەم و بۆ ئەوەش نانووسم خەڵات بکرێم. هەرچەند ویستم قەناعەتی پێ بکەم، کە ئەوە گوزارشتێکە لە خۆشەویستیی ئێمەومانان و خوێنەران و نێوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردی لە ئاست باڵای بەرزی قەڵەمەکەی ئەودا، بەڵام دووبارەی کردەوە و گوتی کاک ئازاد دەڵێم گەر منت خۆشدەوێ ناوم بۆ ئەو خەڵاتە بسڕەوە. ئیتر منیش ناچار بە قسەیم کرد.

مامۆستا عەزیز پەیوەندییەکانی زۆر سنووردار بوون، بەڵام بەدرێژایی ساڵانی ڕابردوو بە تەلەفۆن هەواڵیم دەپرسی، یان جەنابیان تەلەفۆنیان دەکرد و بەمجۆرە ئاگامان لە یەک بوو.

دواجار کە مامۆستام بینی، ساڵی ٢٠١٩ بوو، لە پێشانگەی نێودەوڵەتیی کتێب لە سلێمانی. من سەرگەرمی سەیرکردنی کتێب بووم، کە یەکێک لە دواوە بانگی کردم و گوتی کاک ئازاد کوێت؟ کە ئاوڕم دایەوە، سەیرم کرد مامۆستا عەزیز گەردییە. تەوقەمان کرد و ئەملاولای یەکمان ماچ کرد و کەوتینە دەمەتەقێ سەبارەت بە کتێب و وەرگێڕان و کارە تازەکانی، هەروەها دەستخۆشیم لێ کرد بۆ وەرگێڕانی ڕۆمانێک کە ناوی 'ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد' بوو، لە نووسینی کۆنستانتین ڤێرجیل گیۆرگیۆ، کە کاتی خۆی بە فارسی خوێندبووومەوە و باس لە پیاوێک دەکات کە بە نیازێکی ئینسانیی پاک و بێگەردەوە دەیەوێ بژی و کار بکات، بەڵام هەمیشە لەلایەن کۆمەڵگەکەیەوە، ڕووبەڕووی نائومێدی و ئازاردان دەبێتەوە و غەدری لێ دەکرێ، بۆیە دواجار هەر تەنیا دەمێنێتەوە.

وا هەست دەکەم چارەنووسی مامۆستا گەردییش لە هەندێ ڕووەوە بشوبهێتە سەر چارەنووسی پاڵەوانەکەی ئەو ڕۆمانە، گەر سەختتریش نەبووبێت. جەخار، پێدەچێ قەدەری مرۆڤە داهێنەر و گەورەکانی ئەم میللەتە هەر وابێت، تا لە ژیاندان فەرامۆش دەکرێن و ئازار دەدرێن و بگرە هەندێ جار سووکایەتیشیان پێ دەکرێ، کاتێکیش لەپڕێکدا لەبەرچاومان نامێنن و بۆ هەمیشە ماڵئاواییمان لێ دەکەن، ئینجا ویژدانمان ئازارمان دەدات، یان ڕەنگە ئەوەش جۆرە نواندنێکی ناچاری بێت لە ئاست گەورەیی ئەواندا.

بەڵێ، عەزیز گەردییش پیاوێک بوو تەنها بۆ پەیڤ و کتێب ژیا و تەنیا ژیا و تەنیاش دواسەفەری خۆی کرد.

ئەی پیاوە گەورەکە، تۆ بە جەستە لەبەر چاومان ون بوویت، وەلێ تا زمان و ئەدەبیاتی کوردی و کتێبی کوردی بمێنێت، ڕۆحی تۆیش چەشنی پەروانە بەدەوری پەیڤەکانماندا باڵەفرە دەکات. ڕۆحی تۆ ڕۆحێکی جاویدانە و بۆ هەتاهەتایە لەگەڵماندا دەمێنێتەوە.

٢٠٢٢/٦/٦



# کەسێتیی عەزیز گەردی

سابیر ڕەشید

نووسین لە بارەی کەسێکی گرنگی ئەدەبی وەک د. عەزیز گەردی وەها ئاسان نییە، بەڵکو بوێری و وردبینی و توانا و سەلیقەی دەوێ تا بتوانین لەو ئاستە بین باسی مامۆستا و پسپۆڕ و لێزان و ڕۆشنبیر و توێژەر و وەرگێڕێکی کارامە و لێهاتوو بکەین، هەروەها باسی کەسێتییەکی خۆشەویست و ناسراو بکەین لای ڕۆشنبیرانی کوردستان، بە هەموو پارچەکانییەوە.

من لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکانەوە بە هۆی هاوڕێم نووسەر و هونەرمەند شێرزاد ڕەنجەڕۆ مامۆستا عەزیزم ناسی، ئەوکاتە ڕەنجەڕۆ لەپێش مزگەوتی قیبلەخواری وێنەگری شەمسی بوو، منیش زۆر دەچوومە لای و لە کۆمەڵەی هونەر و وێژەی کوردیش پێکەوە ئەندام بووین، تازە خولیای خوێندنەوە و نواندنمان لا پەیدا ببوو، مامۆستاش دەهاتە لای و بەردەوام کتێبی لەبن هەنگڵی بوو، پیاوێکی خاکی و دەم بە بزە و پێکەنین و سوعبەتچی بوو، بەزۆری کورتەک و شەرواڵ، یان پانتۆڵ و کراسێکی لەبەر بوو، بایەخی بە جل و بەرگ و بۆیەکردنی پێڵاوەکانی نەدەدا، جاری وا هەبوو لەگەڵ کورتەک و شەرواڵ پشتێنەکەشی نەدەبەستا.

ساڵی 1972 – 1973 لە لایەن نەژاد عەزیز سورمێ و ئازاد جوندیانی و چەند نووسەرێکی تر گۆڤارێک لە قەوارەی کتێب بە ناونیشانی (بەرەو ڕووناکی) لە گەلالە دەردەچوو، تەنیا سێ ژمارەی لێ دەرچووە، لە یەکێک لە ژمارەکان شیعری (بۆ کوردستان)ی (مەحموود دەروێش) بە ئیمزای (ڕاوچی) کرابووە کوردی، ئەم شیعرە زیاتر مەحموود دەروێشی لا خۆشەویست کردم، بەڵام نەمدەزانی (ڕاوچی) کێیە، تا سەرسامی خۆم بۆ ڕەنجەڕۆ دەربڕی و ئەویش پێکەنی و وتی: دەزانی ڕاوچی کێیە!

منیش وتم: ناوەڵڵا نازانم، بەڵام وەک بڵێی خۆی ئەو شیعرەی بۆ کوردستان نووسیبێ، نەک وەرگێڕان بێت، لە خۆشەویستیان هەموو شیعرەکەم لەبەر کردبوو.

شێرزاد پێکەنی و وتی: ئەوە مامۆستا عەزیز گەردییە.

وتم: چۆن دەزانی؟

وتی: دەزانم و لێم مەپرسە چۆن دەزانم.

ئەوەبوو من و ڕەنجەڕۆ بووین بە دەروێشێکی ماڵەکەی عەزیز گەردی، ئەوکاتە ماڵیان لە تەیراوە، جادەی بەحرکەی کۆن بوو، لەگەڵ براکانی لە خانوویەکی بچووکدا دەژیان، ناوە ناوە دەچووینە ماڵی مامۆستا عەزیز و لەوکاتەوە خۆشم ویست، ئەلحەقی ئەویش زارو لوتفی لەگەڵ ئێمە خۆش بوو، بەردەوام کتێبی دەداینێ و ڕێنمایی دەکردین و بوو بە برا گەورەمان.

* مامۆستا عەزیز زۆر ڕقی لە ستایشکردن و باسکردنی ڕووبەڕوو بوو، بەتایبەتی ئەگەر لە بەردەمی خۆیدا لای نووسەران، یان برادەرانی ستایشی بکرایە. ماوەیەک بوو خۆی لە ڕەنجەڕۆ لادەدا و دوور لە شوێنی کار و کامێراکەی پێچی دەکردەوە و خۆی تێنەدەگەیاند، نزیکەی مانگێک زیاتر بوو شێرزاد نەیدەگوت با بچینە ماڵی مامۆستا عەزیز، پێم سەیر بوو، دوایی لە شێرزادم پرسی، ئەویش وتی: ماوەیەکە خۆم لێ دوور دەخاتەوەو هۆیەکەیشی نازانم.

ڕەنجەڕۆ خەمی لەوە دەخوارد نەیدەزانی مامۆستا بۆچی لێی توراوە و زۆریش پێی دڵتەنگ بوو، چونکە لەمن زیاتر مامۆستای خۆش دەویست.

ڕۆژێکیان دووەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو، ڕەنجەڕۆ هاتە لای من و چووینە بن لەیلووکان و دوایی بە دەوری قەڵاتدا سووڕاینەوە، شێرزاد وتی: بۆ نەچینە لای تەیراوە.

وتم: بە خوای خولیای ماڵی مامۆستا عەزیزت هەیە و دەتەوێ بەم جەژنە لەگەڵت ئاشت بێتەوە.

وتی: ئەرێ وەڵڵا بۆ نەچین، جەژنە و قابیلە نەهێڵێت بچینە ماڵەکەی و نەمبەخشێ.

ئەوەبوو چووین، دوایی زانی لەبەر ئەوە بووە لێی تووڕە بووە، چونکە جارێک لەگەڵ کۆمەڵەنووسەرێک پێکەوە لە چایخانەکەی عوسمان دانیشتوون و ڕەنجەڕۆ بە ئامادەبوونی مامۆستا عەزیز ستایشی کردووە، مەدحی ئەدەبەکەی و بەرهەمەکانی کردووە. مامۆستا ئەمجارەیان لەبەر جەژن و لەبەر خاتری من بەخشی، ئیتر ڕەنجەڕۆ تۆبەی کرد و منیش بۆم بوو بە وانە و هەرگیز لە بەردەم مامۆستا ستایشم نەدەکرد، بەڵکو لەم دانیشتنانەشدا کە لەگەڵ چەند نووسەر و ئەدیبێک لە چایخانەی شەوانی هەولێر کە ئێمەش دەچووینە لایان و دادەنیشتین، کە باسی مامۆستا عەزیز دەکرا، بۆ ئەوەی مامۆستا دڵخۆش بکەم، دەمگوت: عەزیز گەردی، هیچی لەباردا نییە، یانیش خۆم کڕ دەکرد و ستایشم نەدەکرد، ئەویش ئەوەی پێ خۆش بوو.

* مامۆستا عەزیز یەکێک لە سیفاتە جوانەکانی ئەوەبوو زۆر سەخی و بەخشندە بوو، حەزی دەکرد ڕێز لە برا گەورایەتی ئەو بگیرێت لای ئێمە، چونکە ئەوکاتانەی لەگەڵماندا سەفەری دەکرد پێی ناخۆش بوو ئێمە پارەی ئەو بدەین، تەنانەت پارەی خۆشمان بدەین، هەموو جار کە کاتی پارەدان دەهات، دەیگوت: کامەمان برا گەورەین؟

ئێمەش دەمانگوت: بێگومان تۆ.

ئەویش دەیگوت: دەکەواتە دەبێ برا گەورە پارە بدات. بچووباین بۆ چێشتخانە و چایخانە نەیدەهێشت ئێمە پارە بدەین، منیش هەموو جار دەمگوت: مامۆستا تۆ برا گەورەی و پارەکەی دەداین، دەمانزانی دڵی بەوە خۆشە کە وەک برا گەورەیەک ڕەفتاری لەگەڵدا دەکەین.

* مامۆستا لە هەڵبژاردنی برادەر و ناسینی کەسایەتیی نووسەران و ڕەفتارییان زۆر سەرناس بوو، تەنانەت زۆرجاران منیشی لەو کەسانە ئاگادار دەکردەوە کە هاوڕێیەتیم دەکردن، بەتایبەتی لە سەردەمی بەعسدا دەیزانی کێ نووسەری پاک و ڕاست و کوردپەروەرە و کامە نووسەریش جاسووس و ڕاپۆرتنووس و کاسەلێس و لەژێرەوە پیاوی ڕژێمە، چەندان جار داوای لێکردووم برادەرایەتی فڵانکەس نەکەم، چونکە جێی گومانی ئەوبوو، دواییش لە دوای ڕاپەڕین فایلەکان ئاشکرا بوون، قسەکەی ڕاست بوو، هەموو ئەوانەی دەستنیشانی دەکردن فایلییان دۆزرایەوە.

* مامۆستا عەزیز پیاوێکی زۆر داوێنپاک بوو، هەمیشە ڕێزی لە ئافرەت دەگرت و لای ئەو پایەیەکی تایبەتی هەبوو، وەک مرۆڤێکی هاوشانی پیاو سەیری دەکرد، گاڵتەی بەوە دەهات کە دەیانگوت: ئەدەبی ئافرەتان، یان قەڵەمی ئافرەتان، ئەو دەیگوت: داهێنان و نووسین هەریەک شتە چ پیاو بینووسی و چ ژن، نموونەشمان ئەوەیە بەرهەمەکانی ئۆریانا ڤالاچی و زۆر لە نووسەرانی تری ژنی کردبووە کوردی.

* مامۆستا لە ژیانی خۆیدا خۆی لە کۆتوبەندی پێکهێنانی خێزان پچڕاندبوو هەرگیز بیری لە هاوسەرگیری نەدەکردەوە و بۆ ئەدەبەکەی ژیا، ئێمە هەموو جار کە لێمان دەپرسی: مامۆستا بۆچی ژن ناهێنی و خێزان پێکەوە نانێیت؟ ئەویش لەم پرسیارانە تووڕە نەدەبوو و دەیگوت: کتێب ژن و هاوسەری منە و کتێبخانەش خێزانم.






* مامۆستا زۆر حەزی لە وێنەگرتن نەبوو، لەگەڵ هەموو کەسێکش وێنەی نەدەگرت، بەڵام ئەوەی خۆشی ویستبا ڕەتی نەدەکردەوە وێنەی لەگەڵدا بگرێ، من بۆ خۆم هەرگیز تەنیا جارێکیش لاری نیشان نەداوە لە وێنەگرتنی لەگەڵدا، چ لە گەشت و چ لە ماڵەکەی و چ لە دوکانی خۆمدا، بەڵام تێبینی ئەوەبوو وێنەکە بڵاو نەکرێتەوە، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە فیس بووک پەیدابوو، تاکە مەرجی ئەوەبوو وێنەکە دەگرێ، بەڵام نابێ لە فەیسبووک و سۆشیال میدیا بڵاو بکرێتەوە، بۆیەش زۆربەی وێنەکانی من لەگەڵ مامۆستا لەناو ئەلبوومەکەمدا هەڵگیراوە.

* مامۆستا عەزیز هەموو کتێبەکانی یەکجار چاپ کراون، هەرگیز ڕێگەی نەدەدا چاپی دووەمیان هەبێت، دەیگوت: ئەگەر کەسێک خوێنەری جیددی بێت

با بە دوای کتێبەکاندا بگەڕێ و بیدۆزێتەوە، دەیگوت: ئەگەر چاپی دووەمیان بکەمەوە دەبێ پێیاندا بچمەوە، منیش ئەو دەرفەتە بە بەرهەمی تر دەرەخسێنم.

* مامۆستا عەزیز بۆ دەسکەوتنی زانیارییەک، وەڵامی پرسیارێک، ناونانی بابەتێک، زانینی زاراوەیەک، ئامادەبوو شارەوشار گوندوگوند و هەموو شوێنێک و هەر کەسێک لە هەر کوێیەک بێت بەسەر بکاتەوە.

ساڵی (1982) بوو کتێبی (ژیانی ئافرەتی کورد)ی لەبەر دەست بوو کە لە ئینگلیزییەوە دەیکردە کوردی، لە بەشێکی کتێبەکە باسی جۆلایی و ئامێری جۆلایی تێدابوو، دەیویست ناوی کەرەستەکانی ئامێری جۆلایی بزانێ و لە کتێبەکەی وردبین بێت، زانیبووی جۆلایەک لە گەڕەکی (بێترمە)ی شەقڵاوە هەیە ناوی (مام یاقووب جەجی)یە، هێشتا لە دوکانە بچووکەکەی کاری جۆلایی دەکات و ڕانک و چۆغەی پیاوان دەچنێ، ئێوارەیەکیان وتی: خۆشناو لەگەڵم دێیتە شەقڵاوە بچینە لای ئەم جۆلایە؟

وتم: مامۆستا چۆن لەگەڵتدا نایەم، ئەوەبوو سەعات (9)ی بەیانی لە گەراجی شەقڵاوە یەکترمان گرتەوەو چووینە شەقڵاوە، لەوێ مامۆستا (مەجید عەبدولڕەحمان)ی کوڕە پوورم و مامۆستا (زرار سەرتاش)مان دۆزییەوە و چووینە لای مام یاقووب و مامۆستا ناوی هەموو کەرەستە و بەشەکانی ئامێری جۆلای لێپرسی، دوایی نیوڕانە چووینە ماڵی مامۆستا مەجید و پوورم دۆڵمەی لێنابوو بە دڵی مامۆستا بوو، دوایی چووین لە شەقڵاوە پیاسەیەکمان کرد، گەیشتینە لای فندق مەشکور، برادەرێکی مامۆستا مەجید بەوێدا ڕەت بوو کامێرای لە دەست بوو، چاک و چۆنییان کرد و پرسی بە مامۆستا کرد مادام ئەو برادەرە کامێرای لایە با وێنەیەکی یادگاری بگرین، ئەویش هەرچەندە پێی خۆش نەبوو، بەڵام دڵی نەشکاندین و وتی: خۆشناوینە دەرهەقتان نایەم، چاکەتان لەگەڵدا کردووم و ئێوە سێ کەسن و منیش بە تەنیا گەردیم، داواکەتان ڕەت ناکەمەوە، ئەوە بوو وێنەیەکمان لە شەقڵاوە لەگەڵ مامۆستا بوو بە یادگاری.

* مامۆستا عەزیز هەرگیز حەزی نەدەکرد کتێب بە دیاری وەربگرێت، ئەگەر ناچار نەبوایە پێی خۆش نەبوو، دەیگوت: دەیکڕم و هانی خاوەنەکەی دەدەم کتێبەکەی بفرۆشرێت.

کە کتێبیشی چاپ دەکرد، کتێبی نەدەبەخشییە هەموو کەس، ئەگەر بشیبەخشییایە بە دیاری حەزی نەدەکرد لەسەر کتێبەکە بنووسێ و ئیمزای بکات.

ساڵی (1978) بوو، قوتابی کۆلیجی یاسا و ڕامیاری بووم لە بەغدا، کۆلیجەکەمان کەوتبووە پشت کۆڕی زانیاری کورد، ئێمە بەردەوام سەرمان لە کۆڕی زانیاری کورد دەدا و بۆ قوتابیان داشکاندن هەبوو، کارمەند و فەرمانبەرەکانیشمان هەموو دەناسی، یەکێک لەم کارمەندانەی ئەوکاتە ناوی (ڕەمەزان) بوو خەڵکی دهۆک بوو، تازە کتێبی (ئەدەبی بەراوردکاریی)ی مامۆستا عەزیز گەردی لە کۆڕی زانیاری کورد چاپ کرابوو، ڕەمەزان لە منی پرسی و وتی: مامۆستا عەزیز گەردی دەناسی؟

منیش وتم: بەڵێ باشی دەناسم و برادەرمە.

ئەویش وتی: مادام وایە دەتوانی بەشی خۆی لە کتێبەکەی بۆ ببەیتەوە؟

وتم: بەسەرچاو.

ئەوەبوو دوو شەدە لە کتێبەکەیان دامێ و منیش بەشی ناوخۆکەمان لە کۆلیج نزیک بوو، بردمەوە ئەوێ و دوایی کە گەڕامەوە هەولێر چوومە ماڵی مامۆستا کە ئەوکاتە لە تەیراوە، جادەی بەحرکەی کۆن بوو و بۆم برد.

مامۆستا دانەیەکی لە شەدەی کتێبەکان دەرهێنا و پێیدام، منیش وتم: مامۆستا حەز دەکەم پێشکەشێکم

ەسەر کتێبەکە بۆ بنووسی.
ئەویش وتی: پێویست ناکات بینووسم وا کتێبەکەم دایتێ و تەواو بۆ چییە؟
وتم: مامۆستا هەر ئەوە بە یادگاری دەمێنێتەوە، کاکە هەقی ماندوو بوونەکەم بدەوە.
ئەویش پێکەنی و وتی: هەقت چەندە بتدەمەوە. وتم: هەقم ئەوەیە بە ئیمزای خۆت کتێبەکەم بدەیتێ و لای من ئەوە گەورەترین پاداشتە، ئەویش دڵی نەشکاندم و بە ئیمزای خۆی پێشکەشی کردم، ئێستاش کە تەماشای یادگاری ئەم ئیمزایەی مامۆستا دەکەم، هەموو یادەوەرییەکانم لەگەڵ مامۆستا دێتەوە یاد.
* مامۆستا کەسێکی تا سەر ئێسقان کوردپەروەرو دڵسۆز و بە ئەمەک بوو بۆ خاک و نیشتمانەکەی و ڕقی لە خۆفرۆش و میللەتفرۆش و بێگانەپەرستان و هەڵپەرستان و مرۆڤی سەنگەر گۆڕ و دووفاقیی دەبووەوە، ڕقی لە هیچ حیزبێک نەدەبووەوە، بەڵام تەنیا نەتەوەپەرست بوو و نەدەچووە ژێرباری هیچ حیزبێکەوەو خۆی پێ لە حیزب و دەسەڵات گەورەتر و گرینگتر دەزانی، کوردێکی بێ غەلوغەش بوو، بەڵام کوردێکی مرۆڤ پەروەرو دیموکراس و ئازادیخواز.
* مامۆستا لە سیاسەتیشدا زۆر ئاگادار و لێزان و دووربین و شرۆڤەکار و ئایندەبین بوو، لە پشت پەردەوە هێڵەکانی سیاسەتی دەخوێندەوە و دەیزانی ئایندە بخوێنێتەوە و بڕوای بە دۆزی میللەتەکەی هەبوو، هەمیشە کە لەگەڵ من و شێرزاد و ڕەنجەڕۆ هاوکێشە سیاسییەکانی بۆ شرۆڤە دەکردین و لە ئایندە دەدوا، دەیگوت: ڕۆژێک دادێ ڕاستییەکان سەردەکەون و کوردیش بە ئاواتی خۆی دەگات، بەڵام من نایبینم، ناشزانم ئێوە دەیبینن، یان نا، بەڵام نەوەیەک دێ ئەو ئاواتانەی ئێمە خواستمان ئەوان بۆیان دێتە دی.
* مامۆستا ڕقی لە پلە و پۆست دەبووەوە و زۆر بایەخی بە پلەی زانستی نەدەدا، ئەگەرچی دوو دکتۆراشی هەبوو لە ئەدەبی کوردی و ئەدەبی ئینگلیزی، بەڵام لە هیچ کتاب و نووسینێکی لەقەبی دکتۆر، یان پلەی پرۆفیسۆری خۆی نەدەنووسی، پێی ناخۆش بوو پێی بڵێن دکتۆر، ئێمەش هەمیشە پێمان دەگوت: مامۆستا، چونکە بخککرـی ـ ـــ ـ دڵی گران نەبوو.
* ئەو لە دوای ڕاپەڕینەوە بەهیچ شێوەیەک نە هیچ گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەیەک بەرهەمی خۆی بڵاو نەدەکردەوە، تەنیا کتێبی چاپ دەکرد، چونکە وایدەبینی کە هیی حیزب و سێبەرن و بەمەش وەک عەزیز گەردی مایەوە کە ئەو پێی دەناسرێتەوە.
* مامۆستا لە یەک کاتدا کاری لە چەند بەرهەمێک دەکرد، بۆ ئەوەی ئەگەر لە کارێک بێزار بوو ئەوەی تر ماندووبوونی دەحەسێننەوە و تاقەتی دێنێتەوەبەر، لە ژووری نوستن، لە ژووری میوان، لەناو کتێبخانەکەیدا، هەندێکیانی بە دەست دەنووسی، هەبوو بە قەڵەمی دار و هەشبوو بە قەڵەمجاف دەینووسی و جار جارەش لە لاپتۆپەکەی خەریکی بەرهەمی تر بوو، بۆیەش فرەبەرهەم بوو.
* نەمردم دواجار بۆ دواساتەکانی ژیانی لە نەخۆشخانە سەردانیم کرد و بەخێرهاتنی کردم، بەڵام جورئەتم نەکرد بەم لاشە هیلاک و ماندووەی وێنەی لەگەڵدا بگرم، هەستم دەکرد ئەوا دواساتەکانی ژیانییەتی و دەیەوێت خواحافیزی لە برادەرەکانی بکات و لە ژیانیش ماندوو و هیلاکە و جێمان دەهێڵێ، دواجار وماڵئاوایم بە دڵی پڕ لە خەفەت و چاوی پڕ لە گریانەوە دەستی ماندوو و پڕبەخششیم ماچ کرد و ژیان زۆر خێرا تێپەڕی و ماڵی خۆی پێچایەوە و جێی هێشتین.
* مامۆستا لەبەر ئەوەی بۆ هیچ حیزبێک نەچەمابوو، سێبەری هیچ کەس و بەرپرسێک نەبوو و تەنیا خۆی بوو، بۆیە وایدەزانی حیزبەکان لێی ناگەڕێن ئەو وەها بە سەربەخۆیی و بێ سێبەری ئەوان بژی، هەمیشە هەستی بەوە دەکرد کە بۆی لە کەمین دان، بۆیە خۆی دوورتر و گۆشەگیرتر و دوورەپەرێزتر دەگرت لە دۆست و برادەرەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەمەش لەگەڵ هەندێک لە برادەرانی پەیوەندی هاتوچۆ



و تەلەفۆن و سەردانیشی هەر مابوو.
* لەم نووسینەمدا نامەوێ هەموو یادەوەرییەکانم لەگەڵ مامۆستا عەزیز بنووسمەوە، چونکە تەنیا بە کتابێکی سەربەخۆ دەتوانم ئەو هەموو یاردەوەرییە جوانانەم لەگەڵ مامۆستا بنووسمەوە و کوڵی دڵی خۆم تەواو بخەمە سەر کاغەز، دەنا بە دەیان نووسینی وەهاش ناتوانم باسی سیفات و کەسایەتی و هەڵسوکەوت و قسەخۆش و بەنرخ و ئامۆژگاری و گەورەیی ئەو زاتە بکەم، کە تا قەڵەم دەینووسێ نەک هەر من، هەموو کوردێک خۆشی ویستووە و خۆشیدەوێت و تا دنیا دەمێنێ لە هەست و ویژدان و دڵی هەموو کوردێکدا زیندووە.
پێشنیارم بۆ بنەماڵەی ئازیزی مامۆستا عەزیز گەردی ئەوەیە:
1- کتێبخانەکەی بپارێزرێ و دەستنووسەکانی بە چاپ بگەیەنن، چونکە دڵنیام دەستنووسی زۆرە.
2- خۆیان وەک دەزگایەک لە چەشنی دەزگای مستەفا زەلمی و شێخ محەمەدی خاڵ و هیی تر، کتێبەکانی بۆ چاپ بکەن و چاپی دووەمی کتێبەکانیشی هەر خۆیان ئەو ئیمتیازە بە خۆیان بدەن و نەیدەن بە هیچ کتێبخانە و دەزگایەکی چاپەمەنی تا بازرگانی بە بەرهەمەکانی نەکرێ و ساڵانە لە پێشانگای نێودەوڵەتییەکان وەک خانەی چاپ و کتێبەکانی بۆ بفرۆشن.
3- بە دوای کتێبە دەستنووسەکانی تری بگەڕێن کە لە دەزگای چاپەمەنییەکان ماون و چاپ نەکراون، یان لێیان وەرگرنەوە و خۆیان چاپی بکەن، یانیش وایان لێ بکەن پەلە لە چاپکردنی بکەن.
4- هەفتەی سێ رۆژ کتێبخانەکەی بۆ خوێنەران بکرێتەوە و کتێبەکانیشی نەبردرێتە دەرەوە، بەڵکو کەسێکی خۆیان ئامێرێکی کۆپی باش دابنێت و ئەوەی سەرچاوەی گرنگی کتێبخانەکەی دەوێ بۆی کۆپی بکرێت و لەبری ئەوەش پارەی کۆپییەکە وەربگیرێ و بۆ کتێبخانە خەرج بکرێت.
ئیتر هەرچی بنووسم لە بارەی مامۆستا عەزیز هەر کەمە و قەڵەم لێرە دەوەستێ.
دروود بۆ گیانی ئەو پیاوەی هەموو ژیانی خۆی بە کتێب بەخشی و خۆی کردە مۆم بۆ رووناککردنەوەی کتێبخانەی کوردی و میللەتەکەی.

22/6/2022هەولێر



ئەندرسن

# كچۆڵەی شقارتەفرۆش

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەزیز گەردی



سەرمایەکی زۆر تووش بوو. بەفر و ڕەهێڵە بوو. ڕۆژ لە ئاوابوون بوو. ئەو ئێوارەیە دوائێوارەی ساڵی کۆن و سەرەتای ساڵی تازە بوو.

کچۆڵەیەکی هەژار بە سەرکۆتی و پێخاوسی لەبەر ئەو سەرمایەدا، بەو تاریکییە بە کۆلاناندا دەگەڕا. ڕاستی کە لە ماڵێ هاتە دەرەوە جووتەسۆڵێکی لەپێدا بوو. بەلام سۆلەکان زۆر گەورەبوون. ئەوەندە گەورەبوون دایکی جاروبار بەسەر پێی خۆیەوە دەکردن.

کە بە ڕێگادا دەڕۆیشت لە هیکەوە دوو ئۆتومبیل گڤڤەیان هات و بەلایەوە تێپەڕین. ئەویش لە ترسان بازێکی هەڵدا و دەرپەڕی. سۆلەکانی لەپێ بوونەوە و پەڕینە ئەولاوە. لنگێکی دۆزییەوە، بەلام لنگەکەی دی کەوتە دەست منداڵێکی چەتوون. فڕاندی و گوتی کە کورم بوو بۆی دەکەمە لانک.

کچۆلەکە بەم شێوەیە لە کۆلانان دەگەڕا و دەسووڕا. پێیە بچووکەکانی تەزی بوون و شین و مۆر هەڵگەڕابوون. هەندێ دەستەشقارتەی لە چارۆگەیەکی کۆن پێچابوو. دەستەیەکیشی بە دەستەوە گرتبوو. شقارتەی دەفرۆشت.

بەلام ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ کەس هیچی لێ نەکڕی و کەسیش فلسێکی پێ نەبەخشی.

بەو سەرما و سۆڵەیە، بە زگی بەتاڵ و برسییەوە دەگەڕا. لە خۆی بێکەس و بێنەواتر نەبوو. وای لەو بچکۆلە بەستەزمانە! کلۆ کلۆ بەفر دەکەوتە سەر پرچە درێژ و جوانەکەیەوە. پرچی ئەوەندە جوان بوو لە پشتەوە گلۆازەی کردبوو. بەلام خۆی قەت بیری لە جوانیی خۆی نەدەکردەوە. بە خەیاڵیدا نەدەهات کە کچێکی ئەوەندە قشت و ژیکەڵەیە.

ئەو ئێوارەیە رووناکی لە پەنجەرەی خانووەکان دەدرەوشایەوە. بۆنی چێشت و قازی بریانی کۆلانی پڕ کردبوو. چونکە ئەو ئێوارەیە ئێوارەی سەری ساڵی تازە بوو... ئەدی، کچۆلەکەش هەر بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە.

قوژبنێکی دۆزییەوە، دوو خانوو گەیشتبوونە یەکتر و یەکێک نەختێ لەوەی تر زیاتر هاتبووە دەرێ. لەو قوژبنە هەڵترووکا و پێیەکانی هەڵکێشایەوە بنەخۆی و گرمۆڵەی کرد. قەت سەرمای وای نەدیبوو. نەشیدەوێرا بچێتەوە ماڵێ چونکە ئەو ڕۆژە هیچ شقارتەی نەفرۆشتبوو. یەک فلووسی پەیدا نەکردبوو. ئەگەر بە دەستبەتاڵی بچووبایەوە باوکی لێی دەدا. ئەگەر ئەوەش نەبا، خۆ ماڵەوەش هەر ساردوسڕە، پێخەفیان ساپێتەیە. پووش و پەلاش و بەڕەی ناو درز و دەلاقەکان (با) ناگێڕنەوە... ورشەی دێ دێتە ژوورەوە.

هەر وەخت بوو دەستە بچووکەکانی بقەسرن. وای! ڕەنگە قلەشقارتەیەکی بچووکی بەکەڵک بێ. هەر ئەوەندە غیرەت بکا و قلێک لە دەستەشقارتەکە دەربێنێ و لە دیواری بخشێنێ، دەتوانێ پەنجە سڕەکانی گەرم بکاتەوە. تانی لە خۆیدا قلێکی دەرهێنا. بە دیواریدا هێنا. وش... وش... کڵفاندی و گڕی گرت. برووسکەیەکی گەرم گەشی هاویشت. دەستی تێوەر هێنا. دەتگوت مۆمێکی بچکۆلانەیە، چرایەکی گەشە. کە لە ئاگرەکە ڕاما وایزانی لەبەر سۆبەیەکی ئاسنی گەورەی بزمارکوت دانیشتووە. ئاگرەکەی باش دەسووتا. دڵی بە گەرماییەکە بووژایەوە. بەلام کە پێی دەرهێنا بیداتە بەر سۆبە و گەرمی بکاتەوە. پرت! ئاگرەکە کوژایەوە. سۆبەکە بزر بوو. دارکێکی سووتاوی بە دەست مایەوە و بەس.

قلێکی تری دەرهێنا. دایگیرساند و چەخماخەی دا. دونیای رووناک کرد. تەماشای کرد دیواری بەردەمی وەکو شووشە وا ڕوون بوو. ژوورەوەی لێ دیار بوو. ژوورەکە مێزێکی تێدا بوو. مێزەکە قوماشێکی سپی بەسەردا هەڵکشابوو. تاقمە فەخفوورییەکی ڕێکوپێکی لەسەر بوو. خۆخ و سێوی بەسەردا بڵاو کرابووەوە. تام و بۆیەکی زۆر خۆشی لێوە دەهات. لەوەش خۆشتر ئەوەبوو کە قازەکە لەناو فەخفوورییەکەوە بازی دا دەرێ. چەقۆیەک و چەنگاڵێکی بە دندووکەوە

گرت و بە لەنجە بۆ لای کچەکە هات. لەو کاتەدا، پرت! دەنکەشقارتەکە کوژایەوە. لە دیواری سارد و ڕەق و ئەستوور بەولاوە هیچی لە بەردەمدا نەما.

کچە قلێکی تری لێدا. کە ئاگرەکە پێبوو. وای زانی لەژێر جوانترین درەختی (کریسمس)دا دانیشتووە. درەختەکە زۆر لەو درەختە زلتر و ڕازاوەتر بوو کە پار سەری ساڵ لە شووشەبەندی دوکانی دەوڵەمەندێکدا چاوی پێ کەوتبوو. درەختەکە هەزاران مۆمی لەناو چڵە سەوزەکاندا دەبریسکایەوە. گەلێ وێنەی ڕەنگاوڕەنگی گەورە چاویان تێبڕیبوو، وەکو ئەو وێنانە وابوون کە لە پەنجەرەی دوکاندارەکەدا بوون. کچە بە پەرۆشیی هەردوو دەستی بۆ درێژ کرد. پرت. شقارتەکە کوژایەوە. مۆمەکانی سەرچڵی درەختەکە هەر بەرز بوونەوە تا هەموو بوون بە ئەستێرەی پرشنگدار. ئەستێرەیەک دارژاو کلکە ئاگرێکی سوور و گەش و درێژی لە ناوەندی ئاسمانەوە بەدوو خۆیدا ڕاکێشا.

کچە لە دڵی خۆیدا گوتی: ئای، های، ئەوە پیاوچاکێک عەمری خوای کرد." چونکە داپیری ڕەحمەتی هەموو جارێ کە لەسەر کۆشی خۆی دادەنا، دەیگوت کە ئەستێرەیەک دەکشێ ئەوە پیاوچاکێک دەمرێ و بەرز دەبێتەوە بارەگای یەزدان.

کچە قلەشقارتەیەکی تریشی دەرهێنا و بە دیوارەکەیدا هێنا. شقارتەکە گڕی سەند و ئەو ناوەی ڕووناک کردەوە. تەماشای کرد داپیری سەرسپی لەنێو ڕووناکییەکدا وەستابوو. تا بڵێی جوان و نوورانی بوو. تا بڵێی میهرەبان و دڵنەرم بوو. کچە کە چاوی پێکەوت هاواری کردێ: "داپیرە، بەجێم مەهێڵە، لەگەڵ خۆتم ببە. دەزانم ئاگرەکە بکوژێتەوە توش دەڕۆی. وەکو سۆبە گەرمەکە و قازە بریانییەکە و درەختە جوانەکە بزر دەبیت."

یەک لەسەر یەک دەنکەشقارتەی لێدا. چونکە نەیدەویست داپیرەی بڕوا و بەجێی بێڵێ. شقارتەکانیش ئەوەندە گەش و جوان دەدرەوشانەوە. ببووە ڕۆژی نیوەڕۆ. داپیرەی لە جاران کەڵەگەت و نازدارتر بوو. لێی هاتە پێشەوە و خستیە سەر باسکی و هەردووکیان بە شادی و خۆشی هەڵفڕین و بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە. کە نە سەرمای لێ بوو، نە برسێتی و نە ترس. بە دڵنیایی لە سێبەری خوادا ژیان.

بۆ بەیانی، سبەینێ زوو دیتیان کچەکە بە ڕوومەتی سوور و لێوی خەندانەوە لەو قوژبنە کەوتووە و قنیاتی لەبەر براوە. دوائێوەی ساڵی ڕابردوو لە سەرمان ڕەق هەڵگەڕابوو.

بەیانی ساڵی تازەش کە گزنگی دا، تیشکی لە تەرمە بچکۆلانەکەی کچەکە دا، کە لەو قوژبنە ساردەدا ڕاکشابوو، دەستەشقارتەیەکی سووتاویشی لەتەک کەلەکە ببوو.

خەڵکی کە چاویان پێکەوت، گوتیان: "بەستەزمان! دیارە ویستوویەتی بەم شقارتانە خۆی گەرم بکاتەوە."

بەڵام کەس نەیدەزانی کچە ئەوشەوە چەند شتی جوان جوانی دیوە و لەبەر چ ڕووناکییەکدا بە دیداری داپیری شاد بووە و هەردووکیان پێکەوە چوونەتە ئاهەنگی ساڵی نوێ.

**سەرچاوە:** بەرازەوان، ئەندرسن، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەزیز گەردی، بە یارمەتی بەڕێوەبەرێتیی گشتی خوێندنی کوردی چاپ کراوە، چاپخانەی "الحوادث"، بەغداد ١٩٧٩.





# عەزیز گەردی، مۆنادێکی جیاواز (*)

کەریم دەشتی

1

ساڵی 1978 بوو، لە گەڕەکی تەیراوە، لەگەڵ ئەدیب و وەرگێڕ و نووسەری گەورەی کورد، دەچووین بۆ بازار، زۆربەی ئێوارەکان بەیەکەوە بووین، هاوڕێیەکی زۆر ئازیزم بوو، نێوانمان تا بڵێی باش بوو، بەرهەمەکانی خۆی پێشکەشی من کردبوو، لە ڕێگەدا لە نزیک دادگای هەولێری کۆندا، هەر بە ڕێوە، باس هاتە سەر ئەوەی کە ئەدیب یا شاعیر یا نووسەر، دەبێ چی بکات بۆ ئەوەی فۆرمی تایبەتیی ژیانی ئەدەبیی خۆی وەرگرێت و ببێ بە ناوونیشانی و پێیەوە بناسرێتەوە، زۆرچاک لە بیرمە کە مامۆستا عەزیز گەردی چی پێ گوتم، دەقی قسەکەی مامۆستا عەزیز ئەوەبوو: ئەوەی دەیەوێت لە ژیانی ئەدەبیی خۆی سەرکەوێت، بەرهەمەکانی نەمر بێت، دەبێ ژیانی خۆی بکاتە قوربانی ئەو ڕێگەیە و نەفسی خۆی بکوژێت. ئەمە قسە بە نرخەکەی گەردی بوو، کە زۆر بیگەرد و چەمکوەشێن بوو، من هەر لەو کاتەوە ئەم دەستەواژەیەی مامۆستام لەنێو دڵ و دەروونی خۆمدا هەڵگرتووە و پاراستوومە، چونکە گەوهەری ژێرەوەی دەریایە بە زەحمەت دەستم کەوتووە، هەڵبەت مامۆستا عەزیز کە ئەو گەوهەرەی پێبەخشیم، یەکەمجار خۆی بوو، کە هەموو شادییەکی ژیانی لە خۆی حەرام کردبوو، لەنێو مەملەکەتی کتێب و نووسیندا نەفسی خۆی، لەپێناوی ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیدا کوشت، گەردی کەسی نەبوو، لە ژیاندا، شتێکی بۆخۆی ویستبێت، بەڵکو هەمووشتێکی خۆی بەخشی بە ئێمەی خوێنەران و نێوەندە ئەدەبییەکە تا ئەو ڕۆژەی کە بۆ یەکجاری ئێمەی بەجێهێشت.

2

کاتی خۆی، کە ئێمە لە هەولێر لە سەرەتای خولانەوەدا بووین، لەنێو ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیدا، مامۆستا عەزیز گەردی کتێبێکی چاپ کرد بە ناوی وابزانم چەشەی یا چێژی ئەدەبی بوو، کە یەکێکە لەو کتێبانەی لەوان سەردەمان دەگمەن بوو، بە شێوەیەکی تۆکمە و زمانێکی زۆر خۆش نووسیبووی، بەداخەوە کە ئێستا ئەو کتێبەم نەماوە، بەڵام دەزانم چەند بەسوود بوو بۆ ئێمە و بە تایبەت لەوان دەماندا، کە کتێبی کوردی زۆر کەم بوو، ئەوە بوو لەگەڵ برادەراندا کتێبمان دەگۆڕییەوە، ئەم کتێبەی عەزیز گەردی زۆر خوێندرایەوە، دوای چەندین ساڵ ئەوکاتەی کە ئێمە گەورەبووین و لەنێو کێڵگەی ئەدەبدا هەراش بووبووین، ئینجا کتێبەکەی ڕۆلان بارت سەبارەت بە لەززەتی ئەدەبیمان بینی، ئەوسا عەزیز گەردی لەبەر چاوی ئێمە هێندەی دیکە گەورە بوو.

3

عەزیز گەردی پیاوێکی زۆر زیرەک بوو، هەر کتێبێک بیخوێندبایەوە، زۆر بە جوانی دەیخوێندەوە، بە شێوەیەک دەیخوێندەوە، هەرگیز ناوەڕۆکەکەی لە بیر نەکات، پیاوێکی بەسەلیقە بوو، بە تایبەت لە ڕووی فێربوونی زمانی بیانیدا، ئەو مامۆستای قوتابخانە سەرەتاییەکان بوو، زمانی عەرەبی و فارسی دەزانی، بیرمە هەرجارەی هەوڵی ئەوەی دەدا، کە فێری زمانێک ببێت، شاری جێدەهێشت و دەگەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، کە لە سەرەوەی هەولێر بوو، ئەوکاتە بەحرکە کە شوێنزای ئەوبوو، وەکو گوند وابوو، خانووەکان هەمووی قوڕ بوون، بریتی بوو لە سی چل ماڵێک، بەتایبەت لە کاتی پشوودا، ئیدی ماوەیەکی پێدەچوو، بەردەوام خەریکی ئەو زمانە دەبوو، کە گەڕەکی بوو فێری بێت، ئەوە بوو کە دەگەڕایەوە، هەمان ئەو زمانەی، تا ڕادەیەکی باش فێر بووبوو، بیرمە ئەو کاتەی ئێمە لەگەڵ برادەران دەمانگوت: کە عەزیز گەردی چۆتە دانیشگای بەحرکە بۆ فێربوونی زمان، عەزیز گەردی زمانی عەرەبی، ئینگلیزی، فارسی، فەرەنسی و رووسی دەزانی، جگە لەوەش شارەزای زمانی تورکیش بوو، ئەو پیاوێک بوو لە گەردانەی زمانە بیانییەکان، کە بە زمانی کوردی، هەموویانی دەدرەوشاندەوە.



4

عەزیز گەردی هەموو بەرهەمەکانی خۆی بە دەست دەنووسییەوە، هەر بەرهەمێکیشی چەند جارێ، بە نووسینی دەست دووبارە دەکردەوە، هەموو هەڵەچنینێکیشی بە خۆی ئەنجامدەدا، ئەوەندەی من بزانم زۆربەی کتێبەکانی خۆی بە دەست دەنووسییەوە، بە تایبەت کتێبەکانی هەمووی کتێبی قەبە قەبە بوون، بۆیە دەستی ئەو نووسەرە گەورەیە دەبوایە وەکو پەیکەرێک لە شارەکانی کوردستاندا بەرز ڕابگیرایە، ئاخر نووسەرێکی ئاوا زۆر دەگمەنە لە دونیادا، هەموو ئەوانەش کە دەیکردن بە کوردی شاکارەکانی دونیای ئەدەبی بوون، ڕەوانبێژی یەکێک لەو کتێبە بەنرخانەی مامۆستا عەزیز گەردییە، کە خۆی دانەری بوو، کتێبێکی پڕزانستی ڕەوانبێژی بووە، کە تاوەکو ئێستاش کتێبێکی ئاوا، بەمجۆرە بابەتەوە، لەنێو کتێبخانەی کوردیدا بوونی نییە، خۆی دەبوو ئەم کتێبە بکرێتە مەنهەج لە دانشگاکاندا، چونکە بناغەی فێربوونی زمانی ئەدەبییە، زانستی ڕەوانبێژی، هۆیەکە بۆ خوڵقاندنی داڕشتنی ئێستەتیکی لە زمانی کوردیدا، هەم ئەم کتێبەی و هەم نامەی دکتۆراکەی دەربارەی زانستی عەرووز، دوو توحفەی ناو کتێبخانەی کوردین.

5

عەزیز گەردی لە ئەتمۆسفیرێکی سەخت و ناهەمواری ژیانی کورد، دوای هەموو ئەو زەحمەتیانەی کە بۆی دروست کرا، کتێبی داغستانی منی هەمزاتۆفی تەواو کرد و بە چاپی گەیاند، کە بە هەق لەو سەردەمەدا شۆڕشێک بوو، لە مەودای وەرگێران و هۆکارێکی گرینگی هەستانەوەی خاکدۆستی بوو، چونکە ناوەڕۆکی کتێبەکە، بریتییە لە پەیوەستدانی تاکەکان بە خاک و نەتەوە و کولتووری خۆیانەوە، بۆ ئەو سەردەمی تاکی کوردییش، زۆر لەبار بوو، کە سەردەمی هەڵگیرسان و مەددی شۆڕشگێڕی بوو، هەر زوو لە دوای چاپکردنی و بڵاوبوونەوەی، لە بازاڕ و کتێبخانەکاندا نەمایەوە، ئاستی خوێندنەوەی ئەم کتێبە و ژمارەی خوێنەرانی خۆی لە ژمارەی پێوانەیی تێپەڕی کرد و بەناو شارەکاندا بڵاو بووەوە و پەڕییە ناو شاخ و داخەکانەوە، لە ڕاستیدا ئاگرێکی بەتینی خوێندنەوەی هەڵگیرساند و تا ئێستاش هیچ کتێبێک ئەوەندەی داغستانی من خوێنەری نەبووە، لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا، بەم کتێبە ناوودەنگی عەزیز گەردی چووە ناو درەوشانەوەیەکی ئەبەدی.

6

جگە لەوەی کە عەزیز گەردی، شاکارێکی زۆری ناو دونیای ئەدەب و ڕۆشنبیریی جیهانی کردووەتە کوردی، هەڵبەت لە زۆر بواری جیاجیاشدا پەرەی بە کاری وەرگێڕانی خۆی داوە، هەر بە تەنها کاری لەنێو دەقە ئەدەبییەکاندا نەکردووە، بەڵکو لە بوارەکانی تری وەک ئافرەتان و ئەفسانەی گەلان و گەلێ بواری تریش ڕۆڵی خۆی بینیوە، وەستان نەبوو لای عەزیز گەردی، هەڵبەت خوێندنەوەی بەردەوامیش، بەڵام گەورەترین کاری عەزیز گەردی وەگێڕانی کۆمیدیا بوو، کە بەڕاستی بەتەواوی دەرەقەتی هاتووە و بە زمانێکی هێندە شیرین کاری لەناودا کردووە، خوێنەر هەست بەوە ناکات وەرگێران بێت، من خۆم هەم بە فارسی و هەم بە عەرەبی کۆمیدیام خوێندووەتەوە، بەڵام قەت ئەوەندە عاشقی کۆمیدیا نەبووم، تا وەرگێڕانەکەی عەزیز گەردیم نەخوێندەوە، ئەوسا زانیم عەزیز گەردی کارێکی چەند مەزنی کردووە، دەبێ ئەوەش بڵێم لە هەر وڵاتێک کە کۆمیدیایان کردووە بە زمانی خۆیان، ئاهەنگ و میهرەجاناتی زۆریان بەرپا کردووە، بەڵام داخەکەم لە نیشتمانەکەی مندا زۆر بە بێدەنگی ڕەت

بوو، كە دەبوایە بۆ بە كوردیكردنی ئەم شاكارە مەزنە، ئاهەنگ بگێڕن.

٧

مامۆستا عەزیز گەردی هێندە بایەخی بە ژیانی ڕۆژانە و وێنا و جلوبەرگ و سیمای خۆی نەدەدا، بەڵام پیاوێكی پاكوخاوێن بوو، دەوروبەری كۆمەڵایەتی ئێمە، چونكە لە شتەكان نەدەگەیشتن و نەیاندەزانی مرۆی نووسەر لە چ حاڵەتێكی فیكری و لێكدانەوەی دونیادایە، ئەمەیان پێ هەرس نەدەكرا، بۆیە ئەوان قسەی خۆیان دەكرد و سەرنجیان لا دروست دەبوو، بەڵام قسە و سەرنجەكانیان بە با دەچوو، چونكە مامۆستا عەزیز بایەخی بەوەش نەدەدا. پیاوێكی سادە و بێفیز بوو، لای ئەو ژیانی ئەدەبی و ڕۆشنبیری جوانییەكەیە، مەزنایەتییەكەیە، كەسێتییەكەیە، ڕاستییەكەیە، چما عەزیز گەردی سەیری دەوروبەر و كەسان و خەڵكی دەكرد، تا بزانێت چی لە دەوروبەریدا ڕوو دەدات؟ نا ئەو لەنێو زەین و خەیاڵی تایبەتیی خۆیدا بوو، لەناو تێكستە مەزنەكاندا ژیانی بەسەر دەبرد، ئەو مرۆڤێكی جیاواز بوو، هەموو تەماشاكانی بۆ كتێبخانەكان بوو، هەموو عەشق و خۆشەویستیی ئەو بۆ تێكستە جوانەكان بوو، بۆیە ئەو لە دونیای فانی دابڕابوو، خۆی بۆ دونیای نەمریی ناو مەملەكەتی كتێب هەڵگرتبوو.






8

بەر لە چل ساڵێك دەبێ، ئەو كاتە گەردی ماڵەكەی خۆی بۆ گەڕەكێكی تر گواستبووەوە، وابزانم گەڕەكی مەلایانیان پێدەگوت، گەڕەكێكی تازە بوو، منیش بۆ پیرۆزبایی ماڵە تازەكەی چووبووم، تازە كتێبخانەكەی ڕێكخستبوو، جا كتێبخانەی عەزیز گەردی وەك دووڕ و گەوهەر بە كتێبی ناوازە دەدرەوشایەوە، دیار بوو تازە لە خوێندنەوەی كتێبی



اللامذکرات ئەندرێ مالرۆ بووبووەوە، دوای هەندێ قسەوباس، هەڵبەت قسەوباسی ئەو تەنها ئەدەب ڕۆشنبیری و شیعر و چیرۆک و ڕۆمان و فەلسەفە بوو، گوتی بۆ ئەو کتێبە نابەی بیخوێنییەوە، کتێبێکی زۆر بەسوودە، هەوڵبدە بە وردی بیخوێنیتەوە، لە ڕاستیدا کە کتێبەکەم بە دەستییەوە بینی، زوو سەرنجی ڕاکێشام، بەلام نەمدەزانی چۆنی پێ بڵێم، کە ئەو خۆی پێشنیازی کرد، وەک ئەوە وابوو کوپەیەکم دۆزیبێتەوە پڕ بێ لە مەعریفەت، ئەوە بوو کتێبەکەم وەرگرت، زۆر بە وردی خوێندمەوە، من ئەوکات کتێبەکەی مالرۆم خوێندەوە بە عەرەبی بوو، دوای چەندین ساڵ هەمان ئەو کتێبە بە نرخە، لە لایەن هاوڕێی شاعیرم کاکە دلاوەر قەرەداخییەوە کرا بە کوردی، دەخوازم بڵێم عەزیز گەردی زۆر حەزی بەوە بوو کە کتێبێک ئەو خوێندبایەوە، ئەوانی تریش بیانخوێندبایەوە، چونکە ئەو مەسیحی کتێب بوو، هەموو گیانی بەخشش بوو.

## 10

دوای ئەو هەموو ساڵانەی هاوڕێیەتی من لەگەڵ مامۆستا عەزیز گەردیدا، تا دوارۆژەکانی تەندروستباشی ئەو شامێرە، بۆ ساتێکیش پەیوەندییمان سارد نەبوو، تا بۆ دواجار لەسەر تەختەی نەخۆشی، ئەو مرۆڤە مەزنەم بینییەوە، بەلام ئەوکاتیش چەند کتێبێک لەسەر مێزەکەی بوو، دیار بوو، نەخۆشییەکەی سڕی کردبوو، باوەشم پیاکرد و لە ناخەوە وێران بووم، پەنجەم کوشی گوتم وای بەو پەنجە باریکانە، چ قیامەتێکت بە کتێبان خوڵقاند، بەلام داخەکەم نەخۆشی بڕستی لەبەر بڕیبوو، گەرموگوڕی جارانی نەمابوو، هەر سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، کە پڕ بوو لە هاوڕێکانی، ئەمە دوایین جار بوو ئەو مرۆڤە مەزنە ببینم، ئێستاش کە کۆچی دوایی کردووە، بۆ هەتاهەتایە لە یادەوەریی مندا ناسڕێتەوە و هەر زیندووە، هیوادارم نەتەوە بەدبەختەکەی من بزانێ چ مرۆڤێکیان لەدەستداوە، ئەو مۆنادیکی دەگمەن و جیاواز بوو، وەک تیشک هات و وەک هەتاو ئاوا بوو.

هەولێر 2023

(*) مۆناد: دەستەواژەیەکە تایبەتە بە فەیلەسووفی ئەڵمانی لیبینتز، کە بە مانای جەوهەر دێت کە بناغەی دروستبوونی دنیایە و دووڕدانەی بوونە.

# مامۆستا عەزیز گەردی
# لە نێوان داغستان و بەحرکەدا

**عەتا قەرەداخی**



بۆ یەکەمجار ئەوم لە کافتریای کۆلێژی ئاداب، بە جلێکی کوردی سادەوە بینی، کە بەرەو ڕاڕەوەکە، بۆ دەرەوە دەڕۆیشت، وام لێکدایەوە یەکێک بێت لە کارگوزارەکانی کۆلێژ، بە تایبەتی ناو کۆلێژ و زانکۆ چەند کارگوزارێکی کوردیی شەبەکی لێ بوو، کە شەرواڵێکی کوردی و چاکەتێکیان لەبەر دەکرد، وای بۆچووم کە ئەم پیاوە چاکەتەکەی کردووە بە چۆغە و پشتوێنیشی بەستووە، بەڵام هەر زوو ئەم بۆچوونەم هەڵوەشایەوە، کاتێ بینیم بندەستێک کتێبی پێیە. پاش کەمێک لە نەزەند حەمەسەدیق- کە ئێستا نەزەند بەگیخانییە و شاعیر و نووسەرێکی دیارە-م پرسی ئەو پیاوە کێیە بە جلی کوردییەوە لەناو کۆلێژدا دێت و دەچێت؟ وەڵامی دامەوە چۆن نایناسیت، ئەوە مامۆستا عەزیز گەردییە. من تا ئەو کاتە نەمدەزانی مامۆستا عەزیز گەردی خوێندکاری بەشی زمانی فەرەنسییە، چونکە من پێشتر چەند نووسینێکی ئەوم بینیبوو، بە تایبەتی ئەدەبی بەراوردکاری و چەند ژمارەیەکی ئەدەبی بێگانان و ئافرەتی کورد. ئەوە یەکەم جار بوو من ئەم پیاوە بە جەستە لاواز و سادە و ساکار و کەسایەتیی کەڵەگەت و پایەبڵندە لە دوورەوە و بێ قسەکردن ببینم.

دواتر من لە نزیکەوە مامۆستا عەزیزم ناسی، ئەوکاتە ئەو لە پۆلی سێیەمی بەشی زمانی فەرەنسی بوو، ئەوەی بەلامەوە سەیربوو ئەم پیاوە گەورەیە، کە پێشتر پەیمانگەی مامۆستایانی تەواو کردبوو، نزیکەی پانزە ساڵ مامۆستای سەرەتایی بوو، منداڵانی کوردی فێرکردبوو، ئێستا وەکو خوێندکارێک سادە و ساکار دەهات و دەچوو، کە جارجاریش دەمبینی لەگەڵ هەندێ لە مامۆستاکانیدا قسەی دەکرد، وەکو منداڵێکی سەرەتایی بەئەدەب و بە پەیوەستبوونێکی زۆرەوە ڕادەوەستا و قاچەکانی جووت دەکرد و ڕێک ڕادەوەستا، هەرچۆن مامۆستا لە قۆناغی سەرەتایی پێی دەگوتین وریابە، ئەو لەباری وریابووندا ڕادەوەستا.

ئەو زمانی فەرەنسی دەخوێند، بەڵام پێشتر چەند بابەتێکی لە زمانی ئینگلیزییەوە بۆ کوردی وەرگێڕابوو. دیارە ئەو خۆی فێری زمانی ئینگلیزی کردبوو، لە ڕاستیشدا ئینگلیزییەکەی لە زۆربەی دەرچوانی بەشی ئینگلیزی باشتر بوو، زۆر جار دەمبینی خوێندکارانی کوردیی زمانی ئینگلیزی لێی کۆ دەبوونەوە و پرسیاریان لێ دەکرد. ئەو بەبێ ئەوەی بڵێت ئێوە خوێندکاری بەشی ئینگلیزین و من فەرەنسی دەخوێنم، وەڵامی دەدانەوە و هەندێجار بابەتەکانی بۆ باس دەکردن بە تایبەتی بابەتی ئەدەب، کە دیاربوو ئەو زۆرێک لەو ڕۆمان و دراما و شیعرانەی خوێندبووەوە کە ئێمە وەکو پرۆگرامی خوێندن دەبوو بمانخوێندنایە.

من یەکەمجار لە کۆلێژی ئەندازیاریی شارستانی وەرگیرام و دواتر گواستمەوە بۆ بەشی ئینگلیزی، هەندێ کەس پێیان دەگوتم بێعەقڵییەکی گەورەت کردووە، هەندێکی تر دەیانگوت تۆ چۆن تەنازوولت کردووە، بەڵام مامۆستا عەزیز هەمیشە دەیگوت ئەو کاک عەتایەی کە لە کۆلێژی ئەندازیارییەوە بەرزبووەتەوە بۆ بەشی زمانی ئینگلیزی، هیوادارم هەمیشە لەبەرزبوونەوەدا بێت، هەرگیز تەنازوول لە هیچ شتێکدا نەکات. دواتر وەرگێڕانە نایابەکەی "داغستانی من"ی ڕەسووڵ هەمزەتۆفی پێشکەش کردم و لێی نووسیبوو: ئەم کتێبە کە ڕێنومایی ژیانە و هەمزاتۆف وەکو پەخشانێکی هونەریی نووسیویەتیەوە و تێکەڵی چیرۆک و ئەفسانەی داغستانی کردووە، کە چیرۆک و ئەفسانەی مرۆڤایەتین، بەو گەنجانە پێشکەش دەکرێت کە بەڵێن بە خۆیان دەدەن لە دوارۆژدا خزمەتگوزاریی میللەتەکەیان بن و چییان لەدەست دێت، لەو بوارەدا کەمتەرخەمی نەکەن".

ئەوەی بە کەم کەس دەکرێت ئەوە بوو، کە مامۆستا عەزیز و هاوەڵەکانی، کە ئەوانیش مامۆستای سەرەتایی بوون، دەوامی مامۆستایەتییان گواستبووەوە بۆ خوێندنگەی ئێواران لە هەولێر و ڕۆژانە بەیانیی زوو لە هەولێرەوە دەهاتنە موسڵ و دوای تەواوبوونی وانەکانیان دەگەڕانەوە بۆ هەولێر و فریای دەوامی ئێوارانیان دەکەوتن، واتە لە هەمان کاتدا مامۆستاش بوون و خوێندکاریش، خوێندنی زانکۆی ئەوساش وەکو ئێستا نەبوو، بە تایبەتی لە زانکۆی موسڵ، کە نەهاتن بگەیشتایەتە ڕێژەیەکی دیاریکراو، خوێندکار ئەو ساڵە بە کەوتوو دادەنرا. ئەوەی جێی سەرنج بوو مامۆستا عەزیز هەرگیز ناوی لە لیستی خوێندکارانی نەهاتوودا نەدەبینرا.

من ساڵی یەکەمی خوێندنم بوو لە بەشی زمانی ئینگلیزی، نزیکی نیوەی ساڵ بوو، جارێک چوومە کتێبخانەی کۆلێژ، مامۆستا عەزیز لەگەڵ مامۆستا حسەین عەلی وەلی و مامۆستا عەلی جوکل دانیشتبوو، سڵاوم لێکردن، گوتی وەرە کارم پێتە، لیڤاکسەکەی کردەوە و چەند پەڕەیەکی کۆپیکراوی پێدام و گوتی ئەوانەم بۆ وەرگێڕە، من زۆر بە لامەوە سەیر بوو، گوتم مامۆستا چۆن وەریبگێڕم؟ ئەو گوتی ئەوە چیرۆکێکە قورس نییە، ئاسانە چەند جارێک بیخوێنەوە، بۆ ئەوەی لێی تێبگەیت، هەر وشەیەکت نەزانی لە فەرهەنگ ماناکەی بدۆزەوە و بزانە ئەو مانایە لە ڕستەکەدا گونجاوە، ئەگەر نەگونجا بە دوای مانایەکی تری وشەکەدا بگەڕێ، ئاشکرایە کە وشەی وا هەیە لە زمانی ئینگلیزیدا چەند مانایەکی هەیە. من چیرۆکەکەم لێوەرگرت و بەو ئینگلیزییە کەمەی کە ئەو کاتە دەمزانی و دیارە بە کوردییەکی خراپیش، چیرۆکەکەم کرد بە کوردی، پاش چەند ڕۆژێک کوردییەکە و ئینگلیزییەکەم بۆ بردەوە. لە کتێبخانە لەگەڵم دانیشت، ڕستە بە ڕستە بەراوردی کوردی و ئینگلیزییەکەی کرد و کوردییەکەی من پڕبوو لە هەڵە، ڕستەکانی بۆ ڕاستکردمەوە و ئینگلیزی و کوردییەکەی دایەوە دەستم و گوتی دەست خۆش، زۆر باشە، جارێکی تر وەرگێڕانەکەت بنووسەوە و بیر لەوە بکەرەوە؛ ئاسایی خۆت کاتێک قسە دەکەیت چۆن ڕستەکان دەڵێیت، ئەم ڕستانەش بخەرە سەر شێوەی قسەکردنەکەی خۆت. جارێکی تر کوردییەکەی خۆمم نووسییەوە و بردمەوە بۆ مامۆستا، پاش ماوەیەک بەیانییەکی ڕۆژی شەممە، کە چووم بۆ کۆلێژ، مامۆستا لە بەردەم دەرگای هۆڵی ژمارە حەڤدە وەستابوو، کە من وانەم لەوێ هەبوو، گوتی وەرە، لیڤاکسەکەی کردەوە و دوو ژمارەی ڕۆژنامەی هاوکاری پێدام و گوتی: سەیرکە، ئەوە چیرۆکەکەیە کە وەرتگێڕابوو، بۆم ناردوویت بۆ هاوکاری و لێرەدا بڵاوکراوەتەوە. لە ڕاستیدا من کە ناوی خۆمم بینی نووسرابوو وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە، وامدەزانی خەون دەبینم. زۆربەی کات لەبەر ئەوەی چاوم کزبوو، لە پۆلدا، لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشتم، بەڵام ئەو وانەیە کە بابەتی وتار- ئێسەی-مان هەبوو، دکتۆر دنحە تۆبیا گۆرگیس، کە مامۆستایەکی هێجگار لێهاتوو بوو پێی دەگوتین، لە ڕیزی دواوە دانیشتم، هەر تاوناتاوێ لەژێر دەستمەوە سەیرێکی هاوکارییەکەم دەکرد. هیواخوازبووم چیی زووترە وانەکە تەواوبێت، بۆ ئەوەی بچمە کتێبخانە و جارێکی تر وەرگێڕانەکەم لە ڕۆژنامەکەدا بخوێنمەوە.

بەڵام دواتر کە وەرگێڕانەکەم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت مامۆستا زیاتر دەستکاریی کردووە و کوردییەکەی بۆ چاک کردووم. دوای چەند ڕۆژێک مامۆستا لە کتێبخانە گوتی: وەرە شتێکت بدەمێ. کە چووم دیوانی هێمن و هەواری خاڵی پێدام. گوتی پێشەکیی دیوانەکە و ئەم پەخشانە درێژە بخوێنەوە و سەرنجی وشەکان و ڕستەکانیشی بدە. پاش چەند ڕۆژێک کە ئەوانەم خوێندەوە، بردمەوە بۆ مامۆستا، دوای ئەوە "پێکەنینی گەدا"ی حەسەنی قزڵجی و دارەکەی بەرماڵمان-ی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل و پاییزەخەونی محەمەد مەولوود مەمی بۆ هێنام... بەمجۆرە مامۆستا بەردەوام بوو. دواتر تێگەیشتم مامۆستا دەیەوێت لە ڕێگەی ئەمانەوە کوردییەکەم باش بێت.



مامۆستا عەزیز دوو خاسیەتی زۆر هەستیاری هەبوو، کە دەبوو زۆر وریایانە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەیت، یەکەمیان ئەوە بوو کە زۆر دڵی ناسک بوو، دەبوا بزانیت چۆن لەگەڵی دەدوێیت و چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەیت. دووەم هەرگیز حەزی نەدەکرد نزیک بیتەوە لە وردەکاری و نهێنییەکانی ژیانی. بۆ نموونە هەتا ئێستاش بە تەواوەتی ئاشکرا نییە کە مامۆستا لەدایکبووی چ ساڵێکە. ڕۆژێک لەناو زانکۆ من و ئەو و کاک حەمید عەبدوڵلا و عارف عومەرگوڵ برای ڕەوانشاد دکتۆر مارف گوڵ، لەناو زانکۆ پیاسەمان دەکرد، مامۆستا خلیسکا و کەوتە سەر زەوی، پێکەوە هەڵمانساندەوە، پارە و ناسنامەی زانکۆی کەوتە سەر زەوییەکە، من کۆم کردنەوە و بە دەستمەوە بوو، دەستبەجێ شتەکانی لە دەست وەرگرتم و گوتی خۆ سەیری ناسنامەکەمت نەکرد، لە ڕاستیدا زانیم لەدایکبووی چ ساڵێکە، بەڵام هەرگیز باسم نەکرد، دواتریش چەند جارێک لێی پرسیم ئایا سەیری ناسنامەکەیم کردووە، هەر بە هەمان شێوە وەڵامم دایەوە کە نەخێر، چونکە دەمزانی لێم زویر دەبێت. خاڵێکی تر کە زۆر هەستیار بوو بەرانبەری ئەوە بوو، ئەگەر باسی هاوسەرگیریت لەگەڵدا بکرایە. هەرچەندە ئەو بەردەوام نوکتەی خۆش و پێکەنیناوی بۆ دەگێڕاینەوە، لەو ڕووەوە ئەگەر ئەوەی دەیزانی بینووسیایەتەوە، دەبووە عەلادین سەجادییەکی تر. بەڵام ژیان نهێنیی سەیری تێدایە. ئەم پیاوەی کە هەرگیز حەزی نەدەکرد باسی هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەیت، سەرئەنجام من بۆم دەرکەوت کە لای خۆیەوە عەشقی یەکێک لە کچە خوێندکارە کوردەکان بووە، من وای بۆ دەچووم کە هەرگیز بوێریی ئەوەی نەبێت هەستی خۆی بۆ دەرببڕێت، بەڵام دواجار زانیم کە ئەو بابەتەی لەگەڵ کچەکەدا کردبووەوە، بەڵام دیاربوو کچەکە وەڵامێکی ئەرێنی نەبوو، بە تایبەتیش ماوەی نێوان تەمەنیان زۆر بوو، من وام هەست دەکرد پاساوی کچەکە بۆ وەڵامە نەرێنییەکەی ئەوە بووبێت. ئەوەش پێم وابوو زیاتر دەوری هەبوو لە زیاتر ئاڵۆزکردنی پەیوەندییەکانی مامۆستا و زیاتر بەسەرخۆدا شکانەوەیدا.

خاسیەتێکی دیاری تری مامۆستا سادەیی و بێباکی بوو لە دنیا. ئەو بە ئاستی جیاواز لەگەڵ زۆرینەی خوێندکارانی کوردیی کۆلێژی ئاداب پەیوەندی هەبوو، دیارە هەموانیش هەریەکە بە ئاستێک ئەویان دەناسی، چونکە ئەو دەمە مامۆستا نەک هەر لەناو خوێندکاران، بەڵکو لە ناوەندیی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردیدا ناوێکی درەوشاوە بوو، زۆرینەی هاوتەمەنەکانی ئێمە شانازیمان بەوەوە دەکرد، کە مامۆستا بەیانی باشمان لێ بکات، بەڵام وەکو گوتم ئەو ئاستی پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەشێکمان بەهێزتر بوو، بە تایبەتی ئەوانەی کە بایەخێکیان بە ئەدەب و خوێندنەوە و نووسین دەدا، بەردەوامیش هەستمان دەکرد ئەو پێی وایە بەرپرسیارێتیی هەیە بەرانبەر بەوانەی کە دەزانێت ئارەزووی بایەخدانیان بە ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی هەیە.

لە ڕاستیدا کاتێک من سەیری کەسێتیی مامۆستا عەزیزم دەکرد، بەردەوام ئەو بۆچوونەم لا زیاتر جێگیر دەبوو، کە ئەم پیاوە بە سروشتی بۆ ئەوە خوڵقێنراوە خەریکی ئەدەب و ڕۆشنبیری بێت، لە ڕاستیدا ئەو بێجگە لەو حەز و ئارەزووە سۆفیانەی بۆ ئەدەب و ڕۆشنبیری هەیبوو، لە ڕووی خۆناسینیشەوە زۆر بە جوانی خۆی ناسیبوو، دەیزانی ئەو بۆچی ئەفرێندراوە. هەربۆیە ڕاستگۆیانە هەموو ژیانی بۆ ئەو عەشقە سەرەکییەی خۆی تەرخان کرد، کە لە ڕاستیدا ئەو نەک هەر عەشقی ئەدەب و ڕۆشنبیری بوو، بەڵکو هەم دڵداری لەگەڵ نووسین و وەرگێڕاندا دەکرد، هەم سەرئەنجام هاوسەرگیری لەگەڵ کتێب و قەڵەمدا کرد، لەو ڕووەشەوە ژمارەیەکی لە ئەندازەبەدەر نەوەی خستەوە و گەورەترین خێزانی

هەیە، خێزانی کتێب و گەورەترین ماڵی هەیە، کە ماڵی کتێبخانەیە. تەنانەت عەشقی مامۆستا بۆ کتێب، بۆ نووسین، بۆ وەرگێڕان لە ماوەی بیست ساڵی دوایی تەمەنیدا وای لێ کردبوو، کە نووسین و وەرگێڕان و قەڵەمەکانی و پاشانیش کۆمپیوتەرەکەی، شوێنی هاورێکانی بۆ بگرنەوە و ئەوەیش وای لێ کردبوو تا ئەندازەیەکی زۆر خۆی لە زۆرینەی هاوڕێ و دۆستەکانی و ئەو ڕووبەرە فراوانەی نووسەرانیش دابڕێت، کە زۆرینەیان مامۆستایان خۆش دەویست و بەڕێزەوە سەیری هەوڵ و کۆشش و کەسێتیی نەفسبەرز و هەڵوێستجوان و کارە نایابەکانیان دەکرد. کار و بەرهەمەکانی مامۆستا عەزیز هەم لە ڕووی چەندێتییەوە زۆرن، هەم لە ڕووی چۆنێتییەوە گرنگن، چونکە ئەو دید و تێڕوانینی دیاری خۆی هەبوو بۆ ڕۆشنبیری و کولتووری کوردی و باش دەیتوانی ڕیزبەندی ئەوە بکات کە چی پێویستترە و پێویستە چی لە پێشەوە ئەنجام بدرێت، بە مانایەکی تر لە بارودۆخێکدا کە وەزارەتی ڕۆشنبیری و دامەزراوە ئەکادیمییەکانی کوردستان و زۆربەی دەزگا کولتووریەکان سیاسەت و ستراتیژی کولتوورییان نەبوو، مامۆستا لەسەر ئاستی تاکەکەسیی خۆی، سیاسەت و ستراتیژی جێگیر و چەسپاوی کولتووری خۆی هەبوو، لە ڕاستیشدا بەپێی ئەو سیاسەتە جێگیرەی خۆی کاری دەکرد و گوێی بەوە نەدەدا کە دەرەوەی خۆی چۆن سەیری کارەکانی دەکەن، چونکە ئەو دەیزانی چی پێویستە و دەبێ چی بکات.

بەرهەمەکانی مامۆستا عەزیز زۆر و فرەچەشنن، لە نێوان نووسین و وەرگێڕاندا دابەش بوون. ئەو یەکەم بەرهەمی لە شێوەی کتێبدا لە ساڵی ١٩٦٨-١٩٦٩دا نووسیوە، کە هێشتا لە سەرەتای بیستەکانی تەمەنیدا بووە، ئەویش کتێبی (ڕەوانبێژی)ە لە ئەدەبی کوردیدا، کە لە سێ بەرگ پێکهاتووە. لە ڕاستیدا ئەم کتێبەی مامۆستا هەوڵێکی جددیيە بۆ دانانی کتێبی شێوەپرۆگرام، بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی. لەم کتێبەدا مامۆستا سەرباری سوودوەرگرتنی لە ڕەوانبێژی عەرەبی، سوودی لە ڕەوانبێژی زمانی ئینگلیزییش وەرگرتووە و ئەم کتێبە یارمەتیدەرێکی باشە بۆ خوێندکارانی بەشی زمانی کوردی و ئەدەبی کوردی. لە کتێبە نووسراوە دیارەکانی تری مامۆستا، ئەو بەرهەمەیەتی بە ناوی ئەدەبی بەراوردکاری، کە ئەویش دیسان کتێبێکە سوودی زۆری هەیە بۆ خوێندکارانی بواری ئەدەبی بەراوردکاری. هەر مامۆستا خۆی دوای ئەوەی کە تێزی دکتۆرای لە بواری شیعری کوردیدا نووسی، دواتر تێزێکی تری لە بواری ئەدەبی بەراورددا نووسیوە، کە بەراوردی نێوان "ڕۆمیۆ و جولێت"ی شکسپیر و "مەم و زین"ی ئەحمەدی خانییە. بێجگە لەو لێکۆڵینەوە قووڵەی کە بە میتۆدی نوێی ئەدەبی بەراوردکاری نووسیویەتی، وەکو تەواوکەری تێزەکەی، هەم ڕۆمیۆ و جولێتی لە ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی، هەم مەم و زینی لە کوردییەوە بە ئینگلیزییەکی بەرز و دەوڵەمەند و بە زمانێکی شاعیرانە کردووە بە ئینگلیزی. وەکو ئاشکرایە پێشتریش مامۆستا عەزیز فەرهەنگی بۆ مەم و زینی ئەحمەدی خانی کردبوو.







لە بەرهەمە ناوازەکانی تری مامۆستا عەزیز، کتێبی "ڕابەری شیعری کلاسیکی کوردی" و کتێبی "ڕابەری کێشی شیعری عەرووزی کوردی"ن، مامۆستا لەم دوو بەرهەمە گەورە و دەوڵەمەندەدا کێشەکانی شیعری کلاسیکی کوردی لەسەر بەحرەکانی خەلیلی ئەحمەدی فەراهیدی دیاری کردووە و بنەمایەکیشی داناوە، کە بەو پێیە دەتوانرێت کێشەکانی شیعری کلاسیکی کوردی دیاری بکرێت. کە ئەوەش بایەخێکی زۆری هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی شیعری کلاسیکی کوردی. هەر وەک بە جیاش کتێبێکی لەسەر کێشی شیعری شێخ ڕەزای تاڵەبانی نووسیوە. ئەمە بێجگە لەوەی کتێبێکی لەسەر کێشناسی نووسیوە بە ناوی "فەرهەنگی کێشناسی"، کە ئەمەش یارمەتیدەرێکی زۆر باشە بۆ لێکدانەوەی کێشی شیعری کوردی. کتێبەکانی "پەخشانی کوردی و چەشنەی

داهاتوودا قیمەتی ئەفسانە بە دەر دەکەوێت. ئەم قسەیەی خواجە لە مێشکمدا مایەوە و دەمێنێتەوە. کاتێک لە خوێندنی بالاَ/دوکتۆرا وەرگیرام، بیرم لەوە کردەوە کەرەسەی توێژینەوەکەم هەقایەتی ئەفسانەی کوردی بێت، بۆ ئەمەیش تیۆری سیمیۆلۆژیای گێرانەوەم هەڵبژارد. لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت، رۆمان و چیرۆکی نوێ وەکوو بەرهەمی شار، چەند سوودیان لە بنەما و رەگەزەکانی گێرانەوە وەرگرتووە. ئاخر ئەوەی گابریێل گارسیا مارکیزی دروست کرد، ئەو هەقایەتە ئەفسانەییانە بوون، کە داپیرەی بۆی گێرابووەوە. کاتێک ئەو هەقایەت و دەقە ئەفسانەییانەی خواجەی زمانی کوردی بە کوردییان دەکا دەخوێنمەوە، بۆم دەردەکەوێت هەموو نەتەوەکانی دنیا پێوەندییان پێکەوە هەیە. کاتێک ئەفسانەی ئێرانی، ئەرمەنی، سلاڤی، تورکیایی، ئەفریقی، کوردی و ئازەربێجانی دەخوێنمەوە، ئنجا دەزانم مرۆڤ لە کۆندا چۆن پەنای بۆ ئەفسانە بردووە، بۆ ئەوەی دەوروبەری خۆی بناسێت. بۆیەیش دەبینین تیۆریزانێکی وەکو کلۆد لیڤی شتراوس لە رووی ئەنترۆپۆلۆجییەوە دێت لە ئەفسانەی میللەتان دەکۆڵێتەوە و ئەوەیش دەسەلمێنێت، کە ئەفسانەی کۆی میللەتان لێکدییەوە نێزیکن. مێتۆدەکەی شتراوس ناونرا "مرۆڤناسیی بنیادی" بۆیەیش لە بارەی ئەفسانەوە دەڵێت: ئەفسانە زمانە بە شێوەیەکی تایبەتی لە ئاستێکی بەرزی گەشەکردن وەستاوە، بەلاَم واتاکانی، کە بە شێوەیەک لە شێوەکان رەهەندێکی زمانییان هەیە، هەمیشە لە جوولەدایە و بەردەوامە. بۆیەیش کاتێک لە رووی مرۆڤناسییەوە لە ئەفسانە دەکۆڵینەوە، دەتوانین پێوەندیی نێوان ئەفسانە و مێژوو، ئەفسانە و زانست، ئەفسانە و ئایین بدۆزینەوە. ئێستا تێدەگەم، دەڵێم خواجەی من سەدەقت، ئێمە هێشتا لە ئەفسانە تێنەگەیشتووین. میللەتانی دیکە بە وردی خەریکی هەڵکۆڵین و بنکۆڵکردنی دەقە ئەفسانەییەکانی خۆیانن.

وەرگێران یەکێکە لە بوارەکانی مەعریفە. هەموو نەتەوەیەک دەتوانێت ئەدەبی خۆی لە رێیەوە پێش بخات. خواجەی ئێمە بە بڕوای من لە وەرگێڕاندا دوو تایبەتمەندیی هەیە. یەکیان ئەوەیە زمانی وەرگێڕانی خواجە دیارە، بەو زمانە وەردەگێڕێ، کە قسەی پێ دەکات، رستەکانی بێ گرێوگۆڵن، بەرانبەر هیچ شتێک دانامێنێ. خوێنەر بەبێ ساتمە دەتوانێت بخوێنێتەوە. تایبەتمەندییەکی دیکە ئەوەیە خواجەکەمان وەکو پرۆژە و پسپۆری کاری وەرگێران دەکات. دەمەوێ بڵێم راستە وەرگێڕانەکانی هەمەجۆرن، بەلاَم لە ئەفسانەدا پسپۆری وەرگرتووە. کارەکانی دیکەیشی لە هەمان فەزاوە نێزیکن. بۆ نموونە بەرهەمەکانی عەلی ئەشرەفی دەرویشیان، کە دوای وەرگێڕانی سالاَنی هەورین، رەحمەتی دەرویشیان گوتی: ئێستا کوڕێکم بە کوردی قسان دەکات. هاوکات بەرهەمەکانی مەنسوور یاقووتی. ئەوەی لە هەموو سەرنجراکێشترە ئەو خۆرەپێشکەر نییە، خاکەڕا و بێدەنگ خەریکی پرۆژەکانییەتی.

کاتێک وەرگێڕانەکانی خواجەی زمانی کوردی دەخوێنێتەوە، دەزانیت، کتێبناسە. ئەوەی جێی سەرنجە زۆربەی وەرگێڕە کوردەکان تەماشای بازاڕ دەکەن. چ کتێبێک رەواجی هەبێت، یان چ رۆماننووسێک خەلاَتی نۆبێلی وەرگرتبێت، دێن ئەوە بە کوردی دەکەن. تەماشاکەن، هەموو وەرگێڕە کوردەکان رۆمانە ناودارەکانی تۆلستۆی دەکەنە کوردی، ئەو دێت پێچەوانەی ئەوان کتێبێکی تۆلستۆی بە ناوی بەرنامەی خوێندن دەکاتە کوردی، خەمی ئەدەب و پەروەردە لە هەڵبژاردنی کتێبدا بۆ وەرگێران چەند جوانە. خواجەی ئێمە چونکە کتێبناسە، کتێبی داسقە و دەگمەن بە کوردی دەکات. کاتێک ئەو هونەری شیعری ئەرستۆ دەکات بە کوردی، هەموو توێژینەوە و نامە و ماستەرەکانی زانکۆ لە رێی دەستی دوو و

سێ بۆچوونەکانی ئەریستۆیان لە بارەی شانۆ، ئەدەب، شیعر و داستان دەهێنایەوە. ئەو پەراوێزانەی خواجە بۆ کوردییەکەی هونەری شیعر دایناوە، خۆی بارتەقای توێژینەوەیەکی سەربەخۆیە. کاتێک کۆمیدیا خواوەندیی دانتێ بە کوردی دەکات، هەموومان تەنێ لە دوورەوە ناویمان بیستبوو، مەگەر ئەوەی زمانێکی دیکەی زانیبێ، ئنجا خوێندبێتیەوە. کە کۆمیدیای خواوەندی دەخوێنیتەوە، لە دڵی خۆت دەڵێی: پەکوو لەو کوردییە ڕەوانە. بۆ هەموو وشەیەک دیسان خواجە لەم وەرگێڕانەیشدا ماتەڵت ناکات و لێناگەڕێت بە دیار وشەکان دامێنی و خەم لە واتا و پێناسەیان بخۆیت، بارت سووک دەکات و بارتەقای دوو- سێ کتێبان پەراوێزت بۆ دەنووسێت. ئەو کاتێک کتێبێک دەکاتە کوردی، بە شێوازی وەرگێران و کوردییەکەی ئەو کتێبە لە زەین و یادگەی خوێنەردا دەهێڵێتەوە. ئاخر کێ هەیە لە نەوەی ساڵانی حەفتا و هەشتای سەتەی ڕابردوو داغستانی منی حەمزەتۆفی بیر نەبێت. ئەوەی یەک جار ئەم ڕۆمانەی خوێندبێتەوە، بیرکردنەوە و هزری داگیر دەکات. ئەوەی وەرگێڕانەکانی خواجە بخوێنێتەوە، هەموو وەرگێڕانێک ناخوێنێتەوە.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی هەڵبژاردنی کتێب بۆ وەرگێڕان لە کن خواجەی زمانی کوردی، ئەو کتێبانەن لە بارەی کولتوور و ئەدەب و دابونەریتی کوردەوارییە. لە ساڵی ١٩٨٣دا کتێبی ژیانی ئافرەتی کورد لە نووسینی هێنی هارۆڵد هانسن دەکاتە کوردی. ئەم کتێبە توێژینەوەیەکی مەیدانییە لە بارەی ژیانی ژنی کورد. تێدەگەین، ژنی کورد چۆن ژیاوە. هاوکات توێژینەوەیەکی مەیدانی و سۆسیۆلۆژییە بۆ ئەوەی زانین ژنی کورد لە کۆندا چۆن ژیاوە. ئەگەر باسی پرۆژە و کتێبە بژاردەکانی خواجە بکەین، پێویستی بە توێژینەوەی ورد هەیە. خواجەی زمانی کوردی لە وەرگێڕان و نووسیندا هێند ئەمانەتدارە، دەتوانین تیۆرییەکی تایبەت لە بارەی تێز و بیرکردنەوەی ئەو بۆ وەرگێڕان دابڕێژین.






# چۆن (عەزیز گەردی)م ناسی؟

**پ.د. ئازاد حەمەشەریف**
**زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر**



ساڵانی کۆتایی حەفتاکان ساڵانی ئومێد و نائومێدی، گەشبینی و ڕەشبینی، خۆشگوزەرانی و ماڵوێرانی، هەڵپە و کڵپە، چاوترووکاندن و چاوترساندن، ڕووخان و ڕابوون بوو بۆ نەتەوەی کورد بە گشتی و ڕۆشنبیران بە تایبەتی. ئێوارانی هاوینی ساڵانی 1978 و 1979 و 1980 و دواتریش ڕۆشنبیران و دەستەبژێرانی شاری هەولێر لە (گازینۆی شەوانی هەولێر) کەوا دەکەوێتە بناری پیرەقەڵا و پشت (سینەمای سیروان) کۆ دەبوونەوە و ئەوێیان کردبووە جێگە و ڕێگە و پێگەی خۆیان. ساڵی 1979 من تازە ببوومە پۆلی چوارەمی بەشی ئینگلیزی/ کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی بەغدا و لەگەڵ کۆمەڵێک برادەرانی خۆم وەکو کاک (سەلمان سلێمان) و کاک (مەعروف)ی تەیراوە و کاک (سەعدی سەیدانی) و خوالێخۆشبوو کاک (ڕزگار قادر) و کاک (ئاسۆ حەسەن = ئەوسا ناوی کاکل حەسەن بوو)، کاک (غالب محەمەد)ی ناسراو بە (ڕەوەز محەمەد) سەرمان پێکەوە دەنا و بەدەم یاریکردنی دەستێک دۆمینە، یان تاوڵەوە، قسەمان لەسەر ئەدەبی کوردی و بیانی دەست پێدەکرد.

زۆربەی کات لەناو باخچەکەی (گازینۆی شەوانی هەولێر) لە تەنیشت مێزەکەی تەنیشت ئێمەوە ڕۆشنبیران و کەسانی ناودیار و نووسەرانی هەولێر دادەنیشتن. لەناو ئەو کەسە دیارانە پیاوێکی خاکی شەرواڵەپێ و کراسێکی سپیی گەچڵاوی قەدشکاو و پێڵاوێکی تۆزاوی بۆیاغ نەکردوو هەمیشە بە قسە ڕێک و ڕەوان و گوفتارە پڕزانیاری و دڵگەرمییەکەی بۆ ئەدەب بە گشتی و ئەدەبی کوردی بەتایبەتی سەرنجی ڕادەکێشام. ئەو زۆرجار لەگەڵ (نەژاد عەزیز سورمێ) و (سەعدوڵڵا پەرۆش) و (نەوزاد ڕەفعەت) و (جەلال بەرزنجی) و (کەریم دەشتی) و (کەریم سۆفی) و (حیسام بەرزنجی) و جاروباریش (شێرزاد حەسەن) و (سەلاح عومەر) و چەند کاکێکی دیکە دادەنیشتن و باس هەر باسی چیرۆک و ڕۆمان و فەلسەفە و ئەدەب بوو.

چاکم لە بیرە ڕۆژێکیان لەگەڵ هەندێک لەو برادەرانەی سەرەوە لە مێزەکەی تەنیشتمان باس هاتە سەر (نیتشە) و کتێبە ناودارەکەی (زەرادەشت وای گوت) و (کەریم دەشتی) باسی خوێندنەوەی ئەو کتێبەی دەکرد و (عەزیز گەردی)ش لێی پرسی: "بۆم باس بکە چۆن لەو کتێبە گەیشتوویت؟" ئەویش بۆی ڕوونکردەوە ئەو کتێبە زۆر قووڵە و بە جارێک و دووجار خوێندنەوە ئاسان نییە هەموو کۆدەکانی فەلسەفەی (نیتشە) خۆی بەدەستەوە بدات. گفتوگۆکە تا دەهات گەرمتر دەبوو، (کەریم دەشتی) بینی من بە وردی گوێم بۆ گفتوگۆکانیان ڕاگرتووە تا بزانم هەریەکەیان چیتر دەخەنە سەر خەرمانەی تێگەیشتنی منێکی تازەمەلەوان لەناو دەریای بێسنووری ئەدەب و فەلسەفەی جیهانی. لەپڕ (کەریم دەشتی) بانگی کردمە سەر مێزەکەی خۆیان و لێی پرسیم: "ئێوە لە بەشی ئینگلیزی بۆ ساڵی داهاتوو چیی دەخوێنن؟" هەر بەڕاستی ئەمە پرسیارێکی زۆر پەشۆکێنەر بوو بۆ من، چونکە ئاسان نەبوو لەناو ئەو نووسەرە دیارانەی ئەوسای هەولێر منێکی تازەبەسەرپێکەوتوو بتوانم بەوردی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە. بۆ خۆدەربازکردنم گوتم: "بۆ ساڵی ئایندە ڕۆمانی (کوڕەکان و دڵدارەکان)ی (د. ھ. لۆرەنس) و (وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا)ی (جێمس جۆیس) و (بەرەو ڕۆشنگە)ی (ڤێرگینا وۆڵف) (سەرداری مەگەزەکان)ی (ویلیام گۆڵدینگ) دەخوێنین." ئەوسا مامۆستا (عەزیز گەردی) هاتە قسە و گوتی: "ئەوەندە ڕۆمانە بۆ ساڵێک زۆر نییە؟" منیش گوتم: "ئەمە بابەتی دانراومانە بۆ پۆلی چوارەم و دەبێ تەواوی بکەین." باش بوو (کەریم دەشتی) لە ڕێژنەی پرسیاری دیکەی ڕزگارکردم بەوەی گوتی: "ئێوە یەکتر ناناسن؟" منیش بە شەرمەوە گوتم: "دەزانم ناوی مامۆستا (عەزیز گەردی)ە" و (کەریم دەشتی) گوتی: "ئەویش (ئازاد حەمەشەریف) ە."

دوای ماوەیەکی کەم لەو پێکترناساندنەمان ناو و دەنگی (عەزیز گەردی) هەموو ناوەندە تاریکەکانی ڕۆشنبیری وەکو



ڕووناکی تەنییەوە، کاتێک کتێبی (داغستانی من)ی (ڕەسووڵ حەمزەتۆڤ)ی کردبووە کوردی. گرنگی ئەو کتێبە دوای ساڵانێکی زۆری دارمانی شۆڕشەکانی کورد لە دوو لایەنەوە بوو: یەکەمیان پێداگرتنێکی بێپسانەوە بوو لەسەر نەتەوەپەروەری و مافی نەتەوە ژێردەستەکان و خۆشویستنی نیشتیمان تارادەی پەرستن. دووەمیان وەرگێڕانی دەقێکی بیانیی بە کوردییەکی لووس و بێگرێ و گواڵ. هەردوو لایەن ئەوسا بۆ کورد گرنگ بوون، چونکە دێوەزمەی دوژمن چنگی لە هەناوی نەتەوە و کولتووری کوردی بردبووە خوار و دەیەویست هەناوی کورد بەرە بەرە هەڵکۆڵێت.

دوای ئەو دوو سێ دیدارە بە دەگمەن (عەزیز گەردی)م دەبینی، چونکە ساڵی نوێی خوێندن دەستی پێ کردبووەوە و منیش گەڕابوومەوە (بەغدا) بۆ خوێندن. پاش تەواوکردنی زانکۆ، تووشی خزمەتی سەربازی و ڕاکردن لە سەربازی هاتم و ماوەی زیاتر لە شەش مانگ لەماڵەوە خۆم شاردبووەوە. بەڵام لەو ماوەیەدا خۆم خەریکی وەرگێڕانی (مردنی دێوەرەیەک)ی (ئارسەر میللەر) و (ئیمپراتۆر جۆنز)ی (یوگین ئۆنێل) کرد بوو.

ڕۆژێکیان بە پەنادزە دەگەڕام چاوم بە مامۆستا (عەزیز گەردی) کەوتەوە. دوای چاکی و چۆنی لێی پرسیم: "خەریکی چیت؟" منیش گوتم: "ئەوەی ڕاستی بێت، شانۆنامەی (مردنی دێوەرەیەک)م کردووەتەوە کوردی." ئەویش دەست خۆشی لێ کردم و گوتی: "دەتوانم بیبینم؟" منیش گوتم: "زۆریشم پێخۆشە پێیدا بچیتەوە." دوای کەمێک وەستان بەڵێنی پێداچوونەوەی پێدام و کاتمان دانا یەکتر ببینین.

سەرەتا چوومە ماڵیان لە (گەڕەکی تەیراوە)، لە نزیک ماڵی (مەلازادە) سەردانم کرد. کاتێک چوومە ماڵیان شۆک بووم، چونکە ژیانێکی زۆر ساکار و دەروێشیانە دەژیا. لبادێکی ڕاخستبوو و هەر چواردەورەی شوێنی خوێندنەوە و نووسینی کتێب بوو. وابزانم، ئەو ئەوسا لەگەڵ پیرەدایکی دەژیا. لە بیرمە چایەکی تاڵ و پەرداخێک ئاوی شلەتێنی بۆم هێنا. دواتر ڕۆژانە پاش عەسر دەچوومە ماڵیان و ئەو پێی گوتم وا باشترە بچینە (چایخانەی قامیش)ی نزیک (گازینۆی عەنتەر)، تا لەوێ بە ئازادی مشتومڕ لەسەر وەرگێڕانەکە بکەین. بۆ ماوەی دوو هەفتەی ڕەبەق پێنج جار بەسەر (مردنی دێوەرەیەک)دا چووینەوە. بەڕاستی من قەرزاری مامۆستا (عەزیز گەردی)م، چونکە ئەو بە شێوەیەکی پراکتیکی فێرەوەرگێڕان و کورداندنی کردم. کاتێک ویستم ناوی وەک پێداچۆرەوە بنووسم، ڕازی نەبوو و گوتی: "من بۆ تۆم نەکردووە، بۆ کوردم کردووە." ناچار من لە کۆتایی چاپی یەکەمی (مردنی دێوەرەیەک) سوپاسیم کرد و ئەویش ئەمەی پێخۆش نەبوو، بۆیە کاتێک داوای پێداچوونەوەی (ئیمپراتۆر جۆنز)م لێی کرد، دەستی بە ڕوومەوە نا و گوتی: "تۆ بوویتە وەرگێڕێکی باش و چیتر پێویستت بە من نییە." جا نازانم لە سوپاسەکە دڵگران بوو، یان هەر بەڕاستی من ببوومە وەرگێڕ!

هەر دوای پێداچوونەوە بە کتێبە وەرگێڕدراوەکەم، ڕۆژێکیان بە مامۆستا (عەزیز گەردی)م گوت: "من ڕۆمانێکم نووسیوە بە ناونیشانی (سەدەیەک لە تاریکی) و پێم خۆشە تۆیش وەکو برادەرانی دیکەم ڕای خۆتی لەسەر بدەیت و بزانم ئایا لەو کارەدا سەرکەوتووم یان نا؟" چونکە پێشتر ئەو ڕۆمانەم دابووە (قاسم عەزیز)ی شانۆکاری خاڵم و ئەویش دابوویە (کەمال عەبدوڵڵا= ئێستا کاروان عەبدوڵڵا)یە و (کەمال عەبدوڵڵا)ش ئەوسا لە کۆلیژی ئەدەبیاتی زانکۆی سلێمانی لەگەڵ (فەرهاد پیربال) بوو، ئەوانە هەرسێکیان ڕای خۆیان لەسەر ڕۆمانەکە پێگوتبووم، بۆیە حەزم دەکرد بزانم مامۆستا (عەزیز گەردی)ش چی دەڵێت. مامۆستا (عەزیز گەردی)ش بە سوپاسەوە

ڕۆمانەکەی لێ وەرگرتم و دوای خوێندنەوە نیولاپەڕە تێبینیی وردی نووسیبوو و کاتی پێداچوونەوە زۆربەی تێبینیی ئەو و هیی (قاسم عەزیز) و (کاروان عەبدوڵڵا) و (فەرهاد پیرباڵ)م ڕەچاوکردن، بەداخەوە تا ئێستاش بۆم هەڵنەکەوتووە ئەو ڕۆمانەم چاپ بکەم و هیوادارم لە داهاتوویەکی نزیک ڕووناکی ببینێت، نەخوازەڵا تێبینیی چوار کەسی ئازیز جێپەنجەی خۆیان لەسەر گۆڕانکاریی ئەو ڕۆمانە داناوە.

گەلێک ئێواران مامۆستا (عەزیز گەردی) لەگەڵ ئێمەش لە (گازینۆی شەوانی هەولێر) دادەنیشت. ئێوارەیەکیان پاککەرەوەی (گازینۆی شەوانی هەولێر) ئاوی بە مەسینە بەژێر مێزەکەی ئێمە داکرد. وا ڕوویدا هەندێک پریشکی ئاوەکە ڕژایە سەر پێڵاوە بۆیاغ نەکردووەکانی مامۆستا (عەزیز گەردی)، کابرای پاککەرەوە زۆر تەریق بووەوە و دەستی بۆ ژێر مێزەکەی ئێمە هێنا پێڵاوەکانی مامۆستا پاک بکاتەوە، لەو ساتەدا مامۆستا (عەزیز گەردی) دەستی کابرای گرت و لێی نەگەڕا ئەو کارە بکات، کابرا لە شەرمەزاریان کەوتە پۆزشهێنانەوە، بەڵام مامۆستا (عەزیز گەردی) بە خۆی داوای لێبووردنی لە کابراکە کرد و بەمەش پاککەرەوەکە هێندەی تر سەرسام و دۆشداماو بوو.

دواتر ساڵی 1981 من لە ماستەر وەرگیرام و جارێکی دیکە چوومەوە (بەغدا) بۆ خوێندن، بەڵام پەیوەندییمان هەر بەتین بوو. کاتێک ساڵانی 1982 و 1983 کتێبی (ئەدەبی بێگانان) ژمارە (2) و ژمارە (4)ی دەر دەکرد، داوای بابەتی لێ کردم و منیش بۆ ژمارە (2) چیرۆکی (فەلامەرزێکی خۆپەرست)ی (ئۆسکار وایەڵد) و بۆ ژمارە (4)یش شیعری (دیمەنێک لە فیرینزاوە)ی (**ویلیام** ە. ماکێت)م پێیدا و بە سوپاسەوە بۆی بلاو کردمەوە. وەنەبێت مامۆستا (عەزیز گەردی) تەنیا دەستگیرۆیی منی کرد بێت، چونکە هەموو ئەو ناوانەی لە (ئەدەبی بێگانان) بابەتیان بۆ بلاوکراوەتەوە، وەرگێڕی تازەکار بوون و هەندێکیان لە وەرگێڕان بەردەوام بوون و هەندێکیشیان هەر زوو لێچوونەوە.

نازانم مامۆستا (عەزیز گەردی) چۆنی زانیبوو ئەو ڕۆژە من گفتوگۆی ماستەرنامەکەمە و لەپڕ لەگەڵ (شێرزاد حەسەن) لەناو هۆڵی **گفتوگۆ** ... من هەر هۆپێکم لە خۆم زانی. **چونکە** ... گوتبوو ئەو ڕۆژە گفتوگۆم **هەیە و** ... کەوتبووە ناو مانگی (تو)ی ساڵی 1983 ... مامۆستا بۆ چاپکردنی (ئەدەبی **بێگ**...) ... بوو و هەرچۆنێک بێت زانیبووی **گفتوگۆم هەیە** ... دواکەوتن وەکو مامۆستایەکی دڵسۆز ... بوو.

دوای تەواوکردنی ماستەرەکەم ڕۆژێکیان پێی گوتم: "بۆچی نایەیت لای ئێمە لە (زانکۆی موسڵ) ببیتە مامۆستا؟" منیش دوای سوپاسکردن پێم گوت: "ئامادەم." ڕۆژی دواتر لەگەڵ **مامۆستا** (عەزیز گەردی) پێکەوە سواری ئۆتۆمبێلی (موسڵ) بووین، ئەگەر لە بیرم مابێت دیار بوو مامۆستایان (ئەحمەد دزەیی) و (حاجی ئەحمەد) و (حیسام بەرزنجی) و (حسێن عەلی وەلی) و (عەلی جوکل)یش ئەوسا لە (زانکۆی موسڵ) قوتابی بوون. کاتێک چوومە بەشی (ئینگلیزی) و بڕوانامەکەم پیشکەشی (د. یوئێل عەزیز)ی سەرۆکی ئەوسای بەشەکە کرد، بەشی ئینگلیزی زانکۆی موسڵ سووکوئاسان کوردێکی وەک منیان ڕەت کردەوە.

وابزانم ساڵی 1984 بوو، ڕۆژێکیان مامۆستا (عەزیز گەردی) لە (چایخانەی عەبۆ) دانیشتبوو، ئەمجارەیان ڕانکوچۆغەیەکی قاوەیی جوانی لەبەر بوو، من و کاک (سەباح ڕەنجدەر)یش پێکەوە چووینە لای و دانیشتین، (هەرچەندە ئەوەی ئێستا دەیگێڕمەوە لە زاری کاک (سەباح ڕەنجدەر)ەوەیە، بەڵام چونکە کات و شوێن و ڕووداوەکان تێک دەکەنەوە بۆیە بەڕاستی دەزانم و منیش ئاگاکانی ئەو دیدارەم وەکو خەون بەبیردا دێتەوە) ئەوسا مامۆستا (عەزیز گەردی) دەمێک بوو چیرۆکی (فەلامەرزێکی خۆپەرست)ی (ئۆسکار وایەڵد)ی بۆ بلاوکردنەوە لە گۆڤاری (ئەدەبی بێگانان) لێم وەرگرتبوو. دوای دانیشتن دەمەتەقێیەکی زۆری





**وێنەی مامۆستا (عەزیز گەردی) و کاك (شێرزاد حەسەن)، لە کاتی ئامادەبوونی لە گفتوگۆی ماستەرنامەی (ئازاد حەمەشەریف)، لە مانگی ئەیلوولی ساڵی 1983دا، لە کۆلیژی ئەدەبیات- زانکۆی بەغدا. لە ئەرشیفی بەڕێز د. (ئازاد حەمەشەریف).**

لەسەر وشەی (فەلامەرز) لەگەڵدا کردم زۆری پێخۆش بوو کەوا لە وەرگێڕانەکانمدا وشەی ڕەسەنی کوردی وەکو (فەلامەرز) و (دێوەرە) و (ناندین) و (کەسک) و دەستەواژەی (پڕ بە پێ هەڵات) و هتد بەکار دەهێنم. کاتێک ئێمە خەریکی ئەو قسانە بووین، لە مێزەکەی پشت ئێمەوە هەردوو گۆرانیبێژی ناوداری کورد (تایەر توفیق) و (ڕەسووڵ گەردی) لە کاتی یاریکردندا لێیان بووە دەنگەدەنگ. مامۆستا (عەزیز گەردی) ڕووی بۆیان وەرگێڕا و گوتی (گەردی، گەردی هەمیشە سەرگەرمن). ئەمە وایکرد دەنگەدەنگەکە کپ بێتەوە و هەردوو گۆرانیبێژ زۆر بەڕێزەوە بە قسەی مامۆستایان کرد.

دەبا ئێستا بە چاوێکی ڕەخنەگرانە و بابەتییانە و بێکارتێکردنی سۆز و هاوڕێیەتی هەڵوەستە لەسەر بەرهەمەکانی مامۆستا (عەزیز گەردی) بکەین. مامۆستا لە ڕووی چێژی زمانەوانی و لووسی و بێگرێ و گواڵی زمان تا بڵێی جوانووس و پاکنووس بوو. شاکارە بەرزەکانی (داغستانی من)ی (هەمزەتوڤ) و (کۆمیدیای دانتی) و (گەشتەکانی گەلیڤەر)ی (جۆناسان سویفت) و (هونەری شیعر)ی (ئەرەستۆ) و شانۆنامەکانی (لۆرکا) و (نامەیەک لە پەکینەوە)ی (پێرڵ س. بەک) و (قۆڵبڕ)ی (عەزیز نەسین) و (کچەکەی فەرماندە)ی (پوشکین) و (خوا و شەیتان) و (بەرنامەی خوێندن)ی (تۆڵستۆی) و (بەرکوتێکی ژیانم)ی (یەڤجینی یەڤتۆشینکۆ) دانراوە بەنرخەکانی لە بواری (ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا) و (ئەدەب و ڕەخنە) و (پەخشانی کوردی) و (چەشەی ئەدەبی) و (ئەدەبی بەراوردکاری) و (سەروا) و (کێشناسی) شایەنی ئەوەن پەیکەری هەرەبەرزی وەرگێڕان و داهێنان بۆ مامۆستا (عەزیز گەردی) لەسەر دوندی ئەدەب و زمانی کوردی بۆ بنەخشێنرێت.

بەڵام وەرگێڕانی بابەتەکانی (چیرۆکی بەرئاگردان) و (قورینگ) و (بەرازەوان) و (هەقایەتی بەغدایی)



و (ئەفسانەی ئەرمەنی) و (ئەفسانەی ئەفریقی) و (ئەفسانەی تورکیایی) و (ئەفسانەی سلاڤی) و (ئەفسانەی فیرعەونی) و (یەک چیای گەوهەر = کۆمەڵە چیرۆکێکی ئەفسانەیی گەلان) و (درەختی چل داستان) و (دەنکەهەنار: کۆمەڵە ئەفسانەیەکی ئازەربیجانی) و (ماینی چل جوانوو = ئەفسانەی لادێنیشینانی کورد) و (ئەفسانەی کوردی) و (هەقایەتی کوردەواری = سێ دەرمان) و (هەندێ بەستەی کوردی) و (کەوێتی دامەنتاری = کۆمەڵەئەفسانەیەکی بیانییە) و (چیرۆکەکانی هیزۆپ) و (بووکۆکەی قسەکەر) و چەندان بابەتی دی لە ئاستی توانایی و هەڵبژاردنی ئەو زۆر نزمترن و لە رووی بەهای هونەری و هزری و رۆشنبیرییەوە کز و لاوازن و وەکو بارێکی قورس و لەملانگران بەسەر شان و شکۆی ئەو پەیکەرە بەرزەفڕەی مامۆستا (عەزیز گەردی) دەمێننەوە.

ئەگەر هەردوو جەمسەری کارە بەپێز و کارە بێپێزەکانی مامۆستا (عەزیز گەردی) پێک بگرین، وابزانم هەڵە ناکەم ئەگەر بڵێم تەرازووەکە بەلای کارە بەپێزەکاندا دەلەنگێتەوە و ئەگەر مامۆستا (عەزیز گەردی) ئەو هەموو وەرگێڕانە زۆر و زەوەندانەی لە بواری ئەفسانە و داستانەکانی میللەتانی سەر گۆی زەوی نەکردایە بێگومانم خەرمانەی هەوڵ و کۆششی مامۆستای پایەبەرز دەیان قاتی ئێستا سوودبەخشتر و هەزاران خوێنەری دیکەی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا.

هەولێر ٢٠٢٣/١/١٥



# (عەزیزگەردی)
# گۆلیڤەرێك لە هاوكوفەكانی خۆی دەگەڕێت

**ئەدیب نادر**



**"هەر کەسێك لە جیاتی سەروسەمدا و ژاوەژاو موزیك و لە جیاتی کەیف و ڕابواردن خۆشی و شادیی و لە جیاتی زێڕ ڕۆح و لە جیاتی پیشە و کاروکاسبی کاری داهێنەرانە و لە جیاتی گەمژەیی هەست و سۆزی بوێت، ئەوا لەم دونیا ناچیزەیەی ئێمەدا جێی نابێتەوە."**

**هێرمان هیسە**

**ئەو پیاوەی مروەتێکی گەورە دەکەوێتە پێشی**
**ماڵەکەی لە بۆتەی چاوی منداڵانی بەحرکەیە**
**بەحرکە سەرهەتاسەری مزگەوتێکی ڕوخاییە**
**ڕەسووڵ ئاسۆکەی پڕ دەکات لە شەققەی بانگ**
**عەزیز ئەبجەدییەتی کەوتووی خوا**
**لەسەر لەپی لاپەڕەکاندا بە فڕین ئاشنا دەکات**
**بۆ سەردانیی ئەگەر ڕۆیشتی پێڵاوەکانت داکەنە**

من دایمە عاشقی بە ئەمەکی ئەو کەسانەم کە دوور لە ژاوەژاو و جاڕوجەنجاڵە بێماناکان، بەردەوام سەرقاڵی ئەوەن ڕووتەڵانیی ژیان بکەن بە گوڵزار تا شایستەی ئەوە بێت بۆی ببین بە هەنگ. هێرمان هیسە لە ڕۆمانی "گورگی دەشتودەر"دا دەڵێت: پیاوی دەسەلات بە دەسەلات، پیاوی پارەوپوول بە پارەوپوول، پیاوی ملکەچ بە ملکەچیی و پاشکۆیەتی، پیاوی کەوتووە دووی کەیف و سەفا و عەیشونۆشیش بە کەیف و سەفا و ڕابواردن وێران و نوغرۆ دەبن... ئەی داخۆ داهێنەرە مەزنەکان دەکەونە کوێی ئەم هاوکێشەیەوە؟ ئەوانەی لە گوێنە خۆیان لەیاد بچێت و زۆر شت فەرامۆش بکەن، بەڵام ئەرک و بەخشش بەهاگەلێکن جمکی ژیانیانە و هەمیشە لە پێشینەکانی بیریاندا سەقامگیرن. ئایا هیچ شتێکی ئەوان بەر نوغرۆیی دەکەوێت؟ بەرسڤی ڕاشکاوی ئەم پرسیارەیش نەگەتیڤە، زۆر بە ئاسانی لەبەر ئەوەی ئەو شتەی خوێنی شەونخوونی لە چاوەکانیاندا دەوەشێنێ، بە هیچ کلۆجێک ماتریاڵیی نییە، بەڵکو مۆراڵیی و مەعنەوییە و زیادەڕۆییشی تیا بکەن ڕۆحیان پتر و پتر دەخاتە باوەشی تۆخژێنێکی ئاسمانییەوە و تاسە و ئارەزووەکانیان زیاتر زاڵتاو دەدات بۆ دەرخواست کردنی زیاتری ئەو تۆخژێنە بێسەروبەر و لەڕادەبەدەرە. بە ڕستەیەکی تابلێی سادە داهێنان ڕزگاریدەری ئەو زاتانەیە لە نەگریسیی و پیسیی و گڵاوییەکانی ئیگۆیەکی کێویی و خام و تاقە پەنجەرەیەکیشە بۆ گەیشتن بە پاکیزەیی مرۆبوون.

مامۆستا (عەزیز گەردی) کە ئینسانێکی جوانی کایەی داهێنانی ئەدەبیی و وەرگێڕانە، بەبێ چەند و چوون دەکەوێتە ئەم کاتیگۆرییەوە و گوڵدەستەی ئەو ئێلیتە دیارەیە کە شان لە شان دانی زەحمەت و دژوارە. نزیکەی پەنجا ساڵ ئیشکردنی بێلێبڕ لەم کایەیەدا، دەیان بەرهەمی دانسقە لە داوێنی قەڵەمەکەیەوە ڕسکاوە و جێی سەرسووڕمانە، هەڵبەتە بە پێچەوانەی زۆرێک لە وەرگێڕە خاوەن زمانە یەکئاست و نەگۆڕەکان، هەچ کتێبێکی وەرگێڕدراوی چاو لێدەکەی فۆرمێکی جیاواز جیاکاریی دەکات، لەوانەیە هەبن بڵێن: ئەوە بابەتە فۆرم دیاری دەکات، زۆر ڕاستە، بەڵام ئاگایی وەرگێڕ پێویستییەکی پەیگیرە بۆ هاتنەدی ئەم جیاواز بوونەی فۆرم. بێگومان دیاریکردنی ئەو فۆرمانە بە ئاگاییەکی بێڕادەوە بەرجەستە دەکات، لەبەر ئەوەش گرتنی جڵەوی زمان و هەژموونی بەسەرییەوە و ئەمانەت و وەفاداریی بۆ دەقە ئۆریگیناڵەکان کە لێیانەوە کاری وەرگێڕان ئەنجام دەدات، وایکردووە وەرگێڕانەکانی ڕێک بە نووسینەوەیەکی ڕاستەقینەی هەمان ئەو دەقانە بچێت، بەڵام بە زمانی بۆ وەرگێڕدراو.

دیارە من بۆ خۆم "تاڕادەیەک" بە دیقەت و وردەکارانە لە تانوپۆی کتێبەکانیدا بەدووی گرێ و گۆڵ و ناڕوونیی و ئاڵۆزیی و پێش و پاش کەوتنی ڕستە لەکاتی گوێزانەوە و... تاددا گەڕاوم و تابەحاڵ زەفەرم پێنەبردوون، ئینجا پیاوێک هێندە پرۆفیشناڵانە و عاشقانە مامەڵە لە تەک دەقێکدا بکات و چەندین وەرگێڕانی ئەو دەقە بە ئینگلیزیی و فەرەنسیی و عارەبیی و فارسیی پەیدا بکات و بە حەوسەڵەیەکی بێڕادە گەورەوە بەراوردیان بکات، ئیتر چۆن کارەکانی داڵدەی کەلێن دەدەن؟

جا بێگومان ئەو زمانە زۆر تایبەتمەند و نایاب و بێخەوشەی و لەبەر بوونی



ئەو پرۆفێشناڵیزم و بەر کەماڵەیش تێیدا دەکرێ بۆ دارشتنی زمانێکی ستاندارد ببێتە بناغەیەکی مکووم و تۆکمە. دیارە هەر لە حەفتاکانی سەدەی رابردووەوە کە "ئەدەبی بەراوردکاری" و "داغستانی من" و "رەوانبێژی" و "چیرۆکی بەرئاگردان" و... خوێندنەوە، بە ناهەقیشی دەزانم کە لێرەدا بۆچوونی خۆم سەبارەت بە تایتڵی دووەم کتێب پەردەپۆش بکەم و نەڵێم: کە هەر تەنها ئەو بەرهەمە، وێرای گوزەری کاتێکی زۆریش، بەقەد کتێبخانەیەک بەهادارە و کەم کەس دەتوانن بێویژدانییەکی ئەوتۆ بکەن و ددان بەوەدا نەنێن کە ئەو سەروبەندە چەند رۆحی نەتەوەیی تێیاندا ورووژاندووە و بۆ خۆشویستنی هەموو شتێکی کوردانەیش چەند زیاتر جۆشی داون، ئەفسوونی لە وەسف بەدەری خۆیان لێ کردم و هەر ئەو ئەفسوونەیش لە هزر و ئەندێشەمدا وەکو ئەفسانە ئەوی چنی و تا نهۆیش تۆزقاڵێک لە ئەفسوونەکەی جارانی نەکەوتووە و خەرمانەی ئەفسانەیشی لە دەوراندەور نەرەوییوەتەوە. بێگومان سەرباری ئەو هەموو گۆرانکارییانەی دەستەویەخەی ژینگە ئەدەبییەکە بوونەتەوە و لە زۆر روویشەوە بێ سێ و دوو بە نەگەتیڤ لەسەر سەروبەندەکە شکاوەتەوە، کەچی ئەو هەر ئەو بووە و بێ چەندوچوون هەر ئەویش دەمێنێتەوە، ئەو زاتەی مەحاڵە بەرخوردی لەگەڵدا بکەیت و نەتوانیت وەڵامی پرسیارێکی سادەی وەکو "ئاخۆ ئەفسانەیە لە زەمەنی نەمانی ئەفسانەدا، خەونە لە زەمەنی نەمانی خەوندا، یان راستییە لە زەمەنی وردوخاشبوونی راستیدا؟" بدەیتەوە. دەکرێ خۆزگەیەک بخوازم و بڵێم: خۆزگە مامۆستا عەزیز گەردی کورِی میللەتێک بوایە لەو میللەتانەی هەرگیز ناهێڵن تۆزی فەرامۆشیی لەسەر کەڵەپیاوەکانیان بنیشێت، تەنانەت بایەخ بە کورسیی چایخانە دانسقەکەی و پیاڵەی چاتێخواردنەوەکەی دەدا و کتێبخانە و مێزی نووسین و دەستنووس و سکێچی بەرایی نووسینەکانی و نامەکانیان دەپاراست و ماڵ و جێگەی هەڵکردنیان دەکرد بە مۆزەخانە! ئاکامیش بە سێبەری گەورەیی کەڵەپیاوە راستەقینەکانی بواری جیاجیای ئەدەب و رۆشنبیری و زانست و... خۆیان شایانی گەورەیی بکەن، بەڵام...

هەر وەکو لە سەرەتاشەوە گوتم من عاشقی ئەو جۆرە پیاوانەم کە بۆ خۆیان ناژین و بۆ پرسێکی دیکە درێژە بە ژیانی خۆ دەدەن... بۆیە زۆرجار و چ لە دانیشتنە تایبەتییەکانم لەگەڵ ئەهلی خۆشەویستی ئەدەب، چ لە هزر و ئەندێشەی خۆمدا دەبووە بابەتی سەرەکیی و وتووێژم لە بارەی کاری کاری پەیدەرپەی و خزمەتە بێمەرج و بێپایانەکانی ئەوەوە دادەبەست - کە کەرەتێکیان لە سیاقی گفتوگۆ و لە پرسیاری دۆستێکدا، سەبارەت بە ژمارەی کتێبەکانی گوتی: زۆر نین، ئەگەر کەمتەرخەم نەبوومایە دەکرا زۆر لەوە زیاتریش بن - یان لێیان تێدەفکریم، قەت حەزم نەدەکرد لەوانە بم کە گوللە بە رابردووی خۆیانەوە دەنێن، دەمگوت نەبا رەسووڵ هەمزاتۆڤ وتەنی ئایندە تۆپمان تێ بگرێت. ئیدی خۆزگەم دەخواست رۆژێک تەعزیمی بۆ بکێشم و هیچ نەبێ بۆ ئەو قەڵەم و هەوڵە ناوازەیەی "داغستانی من"ی کرد بە ئینجیلی نەوەکەم لە کانگای دڵەوە سوپاسی بکەم. خۆشبەحاڵم کە چەرخ لەم مەسەلەیە لەگەڵمدا چەپگەرد نەبوو، رۆژێکی دیسەمبەری ساڵی2013 لەگەڵ چەند دۆستێکی زێدە قەدرگراندا بۆ خزمەتی چووین. باوەر نەکردەنی بوو، دەتگو سۆفییەکی جەزبە گرتووم و لە پاژنەکانم باڵ رووەوە، وەک بڵێت بۆ دیداری گاندی، یان نیڵسۆن ماندێلا خۆم تەیار کردبێت وابوو. لە بەحرکە، ئەو پیاوەی بەرهەمەکانی لە بەرزترین باڵا بەرزترە، ئەو عیملاقە لە سادە سادەترە پێشوازی لێکردین، هەستم کرد بەرامبەر

باوکێک وەستاوم، بەرامبەر پاڵەوانێکم لە پاڵەوانەکانی وەرگێڕانی ئەم پەنجا ساڵەی ڕابردوو- بە ئێستایشەوە – بەرامبەر پرۆمیسیۆسێکم وەرگێڕانی کردووە بە مەشخەڵێکی بێلێبڕ و باڵەخانەیەکی ناوازەی بێ بونیاد ناوە و سەرلەبەری ژیانی خۆی کردووە بە سووتوو بۆ ئەنجامدانی ئەو هونەرە پەیگیرە و سەرباری چەپگەردیی چەرخیش بەرامبەر بە کارەکەی تا ئەوپەڕی دەستپاک و بە ئەمانەت بووە و تابەحاڵیش لە پراکتیزە کردنی دەستپاکیی و ئەمانەتێکی لە ڕادەبەدەر هەر بەردەوامە. لەبەر کۆسپەی دەرگاکەیدا بۆ ئەو قامەتە باڵایە داهاتمەوە و... بەسەر دەستە هەمیشە جێسەقامی قەڵەمەکەیدا نووشتامەوە و ڕامووسی. لەو باوەڕەیشدام ئەگەر هەتا لە ژیاندا مابم سەری هەموو کاتژمێرێک بەسەر دەستەکانیدا بچەمێمەوە هێشتایش پێم وانییە پێم بکرێت لە ژێر قەرداریی ئەو دەربازم بێت! ئەو چرکەساتانە لەناخی خۆمدا پەیێم بە شپرزەیی برد، وەکو ئەو گەڵایەی کە بای بەر لە باران ڕایدەهەژێنێ و کاژواژی دەکات. بیرم لەوە دەکردەوە بە ماشێنە زەمەنییەکەی هێچ. جی. وێڵز مەوداکانم بڕیوە و گەیشتوومەتە ماڵی جوانترین ئەفسانە. بە هەرحاڵ، بە ڕووشکاوییەکی ڕازئامێزەوە سێ کتێبی خۆمم پێبەخشی و ئەویش بە میهرێکی باوکانەوە لێی وەرگرتم و خۆشحاڵیی ڕوخساری داگیرساند، ئاخر ئێمە کاممان بە بینینی کتێب شاگەشکە نابین و چەشنی پۆلوو نادرەوشێینەوە؟ ئەوەتا – ڕیگۆبێرتۆی شاکەسی ڕۆمانی یادداشتنامەکانی دۆن ڕیگۆبێرتۆی ماریۆ ڤارگاس یۆسا – لە وەسفکردنی ئەو خانووەی دەیەوێت بنیاتی بنێت، دەڵێت: ئێمەی بنیادەمگەل تێیدا دەبینە هاوولاتی پلەی دووەم و: کتێب، وێنە، نەقش و نیگارەکان تێیدا پێشینەی یەکەمیان دەبێت. ئەویش کتێبی (قۆڵبڕ- کە ڕۆمانێکی عەزیز نەسینە و لە فارسییەوە وەریگێڕاوە) پێشکەش کردم، وەک ئەوەی باڵم بداتێ تا پێی بگەمە تەشقاییەکان، پاشان بە شێنەیی کۆمەڵێک بابەت تاوتوێ کران، بە ئاگاییەوە سەرنجی خۆم لە هەسان دابوو، دەق وەک ئەوەی بمەوێ تاقیکردنەوەیەک ئەنجام بدەم، مەبەستم

بەراوردکردنە، ئاخر کە بنیادەم یەکێک تاقیبکاتەوە، بەو کەسانە بەراووردی دەکات کە نموونەی باڵای ئەون. سەرم سووڕما، بەدرێژایی وادەکە بە یەک وشەیش بەلای تۆخکردنەوەی ئێگۆکەی خۆیدا لاینەدا، ورتەیەکی لە دەم نەهاتە دەرەوە سەبارەت بە نزیکەی نیو سەدە ڕەنج و ئیشکردنی لە کایەی نووسین و وەرگێڕان و... کە خۆی لە بەرهەمهێنانی دەیان کتێبی گرنگ و پێداویستدا دەبینێتەوە کە ئەمڕۆ لەگەڵ بوونی ئەو جموجووڵە بە جۆشوخرۆشەی چاپ و بڵاوکردنەوەیشدا بە دەرکردنیان لە کتێبخانەی نەتەوەکەمان موخابن کتێبخانەکەمان بۆ سەروبەندی منداڵێتیی خۆی دەگەڕێتەوە. لەوەش بترازێ، بە پێچەوانەی ئەوەی زۆرینەی ئیشکەرانی کایەی ئەدەب و ڕۆشنبیریمان کردوویانە بە نەریت، بە یەک وشەیش، هیچ کەسێک و هیچ تاقە ناوێکی نەکردە بنێشتەخۆشە، تەنانەت ئەو کەسە جاڕسکەر و ئەزیەت بەخشانەی بەڵگەنەویستە لە ژیانی هەموو تاکێکی داهێنەری وەکو ئەودا بوونیان هەیە نەهاتنە ناو ئاماژەکانییەوە، بەڵام دیار و ئاشکرایە کە کاراکتەری ئەو ئاسا خۆی لەقەرەی ئەو شتە ناچیزانە نادات و بە هەندیان وەرناگرێت و بایەخی خۆی لە چەقی داهێنان و ئافراندنی خۆیەوە بۆ سەر هیچ شتێکی دیکە ناگوازێتەوە. بێگومان باس و خواس چووە سەر زۆر شت، بەڵام هەر هەموو ئەو شتانە لە جوغزی ئەدەب نەچوونە دەرەوە، تۆنی دەنگی ئەو پیاوە زۆر شتی ئاشکرا دەکرد، لەوانە کۆڤان و موعاناتێکی کۆنترۆڵ نەکراوە و سەرباری ئەوەیش دڵی بە نەوەکەی ئێمە هەڵدەقرچا. بە شەرمێکی مرۆییەوە داوای لێبووردنی کرد کە ئاگای تەواوی لە دیمەنی بێسەروبەری ڕۆشنبیری نییە و کەمتەرخەمی کردووە بەرهەمی کەسانێکی وەکو ئێمەی موتاڵا نەکردووەتەوە. گوتی: سەردەم ئەوەندە گۆڕاو و بێسەروبەرە بنیادەم فریای هیچ ناکەوێت، ئێستا وەکو



حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو نییە، بۆ نموونە من ئەو سەروبەندە چەند نووسینێکم بڵاوکردبووەوە و سەرپاکی خوێنەران دەیانناسیم، ئەوە بە دوو یان سێ گوتار، کەچی هەنووکە نووسەر هەیە چەندەها کتێبی هەیە و لە چەند دۆستێکی خۆی بترازێ ئیدی کەسی تر نایناسێت، بەڕاستی ئەم سەروبەندە سەروبەندێکی زۆر نادادپەروەرە و زوڵم و ستەم لە گەلێک نووسەر دەکرێت کە ڕەنگە شایستەی ئەو غەدر و ستەمە نەبن. بێ شک کات زۆر ڕەزاسووک ڕەوتی خۆی گرتبووەبەر، چۆن بوو لەو چرکەساتە دا هەلێکم بۆ ڕەخسا تا لە نەوەکەی ئەوان بدوێم و بەراوردێکی بە نەوەکەی خۆمانی لەگەڵدا بەرقەرار بکەم، بێگومان ئەو کوڕی سەردەمەکەی خۆی و هەموو سەردەمە هاتووەکانە، نە خۆی هەستی بە گرێی ئۆدیب کردووە بەرامبەر بە نەوەی پێش خۆی "دیارە هاتنی ئەوان پاش بۆشایی قۆناغی شەستەکان بوو"، نە نەوەیەکی ئەدەبی پێش خۆی هەبوو، خاوەنی باوکی پاتریارکی (یان ئەوانەی تووشی گرێی ئۆدیب بە ئاوەژوویی بوونە) بێن، ئەرکی خۆی دەبینێت و جێگای هیچ کەسێک قۆرخ ناکات، چونکە ئەو لە شانشینی ئەدەبدا جێگەی تایبەتی خۆی بەرزەفت کردووە. بەڵام ئێمە، باوکی پاتریارکی ئەدەبیمان بۆ پەیدا بوو "گرێی ئۆدیبیان تێدا چاندین" و دووچاری موعاناتێکی زۆری نووسین و بڵاوکردنەوە بووین و لەبریی ئەوەی کارکردێکی ئەدەبییانەی پۆزەتیڤمان لەسەر دابنێن، هەوڵی سڕینەوەمان درا، بە ئاسانی نەمانتوانی زووتر لە ناوەند و کۆنتێکستی ئەدەبەکەماندا جێی خۆمان مکووم و خۆش بکەین، ئەگەر ئیکسیری نووسین نەچوایەتە خوێنمان و شێتوشەیدای ئەدەب نەبووینایە و نەمانکردبایە بە دەستاوێژێکی بێ ئەڵتەرنەتیڤ بۆ خۆ دەربڕین، دوور نەبوو ئێستا یەکێک بووینایە لەو لێبووکانەی باز بەسەر هەموو تەنافێکدا دەدەن، چونکە خاوەنی خۆیان نین. ئیدی چۆن هەست بەوە نەکەین کە کەوتووینەتە میان دوو لوولە تفەنگەوە؟ بەڕاستی نازانم چی بڵێم، ئەو کەسێکە خاوەنی: باکگراوەندێکی تابلێی دەوڵەمەندە، ڕووالەتێکی بێڕادە سادە و ساکاری هەیە، ئاسۆیەکی شارستانییانەی تا ئەوپەڕی ڕوون و بەرفراوان ئاسمانی دنیابینییەکەی دەتەنن. کتوپڕ ئەو پەندە عارەبییە تێهەڵکێشی تێفکرینم بوو کە دەڵێت: "من علمنی حرفا ملكني عبدا" هەستێکی سەیر و ڕمۆکی بارگرانتر بوون دایگرتم، بێ چەندوچوون ئەم پیاوە هێندەی تر منی کرد بە دیلی گەورەیی و داهێنەریی و سادەیی خۆی. ئیتر جاروبار لە گالێری یاد چاو دەگێڕم، باوەڕ کردەنی نییە، کە وێنەیەکی پرشنگداری ئەو زاتە دەگرێتە خۆی، جارجار لێی ڕادەمێنم و بە خۆم دەڵێم: ئەوە منم لە وێنەیەکدا کەوتوومەتە تەنیشت عیملاقێکی ئەدەبەکەمان و یادەوەرییەکی نایاب چوارچێوەیەکی دانسقەی زێڕینمان بە دەوردا چی دەکات؟

شوباتی 2014: هەولێر

# کێشانی وێنەی باڵندەیەک

## ژاک پرێڤێر

وەرگێڕانی لە فەڕەنسییەوە: عەزیز گەردی





یەکەم جار وێنەی ڕکەوێ[1] بکێشە،

دەرگای والا بێ.

ئینجا وێنەی شتێکی نازدار،

شتێکی ساکار،

شتێکی جوان،

شتێکی باش،

وێنەی باڵندەیەک بکێشە.

پاشان لەناو باخچەێی

لەناو لێڕێ

لەناو دارستانێ

تابلۆکە بە درەختێک هەڵپەسێرە و

خۆت لەژێر درەختەکە بشارەوە.

دەنگ مەکە،

مەجووڵێوە،

کە باڵندەکە هات،

ئەگەر هات،

بە کپی سەیری کە

لێی گەڕێ تا دەچێتە ناو ڕکەوەکە

کە چووە ناوی،

هێدی بە فڵچەکەت دەرگای لەسەر داخە.

پاشان هەموو شیشەکانی ڕکەوە بسڕەوە.

وریابە پەڕی باڵندەکە نەئەنگێوی.

پاشان وێنەی درەختەکە بکێشە

جوانترین چڵی بۆ باڵندەکە هەڵبژێرە،

ئینجا وێنەی سەوزایی گەڵا و

تەڕایی ئاو و

زێڕینی خۆر و

جریوەی گیانداری بەرهەتاوی هاوین،

بکێشە و چاوەڕێ بە

تا باڵندەکە دەست بە خوێندن دەکا.

ئەگەر نەخوێنێ

نیشانەی شوومییە.

نیشانەی ئەوەیە تابلۆکەت خراپە.

بەڵام ئەگەر بخوێنێ،

نیشانەی خۆشییە.

نیشانەی ئەوەیە کە تۆ نیگارکێشی.

جا زۆر بە شێنەیی

پەڕێک لە باڵندەکە دەربکێشە و

لە گۆشەیەکی تابلۆکە

ناوی خۆتی پێ بنووسە.

**سەرچاوە:** ئەدەبی بێگانان، بەشی چوارەم، بە سەرپەرشتی: عەزیز گەردی، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی حەیدەری، هەولێر، ١٩٨٣. ئەم بەرهەمە لە چاپخانەی –حسام– لە بەغداد چاپ کراوە.

1 ڕکەو: قەفەس.

# عەزیز گەردی؛ کارکردن لە ڕووبەرێکی کارلێنەکراودا

## (گەشتێکی کرۆنۆلۆژی کورت)

ئارام سدیق



## سەرەتا

هەندێک نووسەر و وەرگێڕ هەیە بۆ مەرگیان گەلێک بەداخ بووم و ئاواتی ئەوەم خواستووە تەمەندرێژتر و بە بەرهەمتر بن، بەڵام مۆتەکەی مەرگ ئاواتەکەی خامۆش کردووم. یەکێک لەو نووسەرانە عەزیز گەردی بوو، کە ساڵانێکی زۆر بەبێ ئەوەی لە نزیکەوە بیبینم ئاواتی تەمەندرێژیم بۆ دەخواست، بۆیە هەم نەخۆشکەوتنەکەی و هەم کۆچی دوایی ئەم زاتە شۆکهێنەربوو بۆم. بەر لە عەزیز گەردی هەمان ئاواتم بۆ شێرکۆ بێکەس لە دڵدا بوو، ساڵانێکی زۆر کە کتێبێکی نوێی چاپ دەبوو ئاواتەخوازی ئەوەم لە دڵەوە دەخواست تا ساڵێکی دیکەش تەمەندرێژ بێت و کتێبێکی نوێی ببینم، تا دواجار بەر لە تەواوکردنی قەسیدەی "یادەوەریی پاسکیلێکی کەرکووکی" مەرگ لەگەڵ خۆی بردی. ئێستاش زۆر نووسەر و وەرگێڕ هەن لە دڵەوە ئاواتی تەمەندرێژییان بۆ دەخوازم، چونکە دەزانم هێشتا وزەی داهێنان لە ڕۆحیانەوە دەچۆڕێت.

نزیکەی بیست ساڵە بەرهەمەکانی نووسەر و وەرگێڕ عەزیز گەردی دەخوێنمەوە و چەند ساڵێکیش خولیای ئەوەم هەبوو لە نزیکەوە ببینم و دووجار لە بەحرکە سەردانی ماڵیم کرد، بەداخەوە دەرفەتی بینینی نەڕەخسا. تا جارێک لە پێشانگەی نێودەوڵەتیی هەولێر بۆ کتێب بینیم و خولیاکەم بووە ڕاستی و گەلێک خۆشحاڵبووم بە بینینی و لەو یەکتربینینە کورتەدا چەند پرسیار و گفتوگۆیەک کەوتە نێوانمانەوە، کە هەرگیز بیرم ناچێت. ئێستا نزیکەی 80 کتێبی چاپکراوی ئەم نووسەر و وەرگێڕە لە کتێبخانەکەمدایە و زۆرێکیانم خوێندووەتەوە. لە دڵەوە عاشقی کارەکانی بووم. سەنگی نووسینەکانی ئەگەر زیاتر نەبووبێت لە وەرگێڕانەکانی هەرگیز کەمتر نەبووە، بۆیە ئەم مرۆڤە ڕۆحسپییە ژیانی ئاوێتەی دوانەی نووسین و وەرگێڕان بوو و لەنێو کارەکانیشیدا لە هەردوو بوارەکەدا (بە شێوە گشتییەکەی) سەرقاڵی کارکردن بوو لەو ڕووبەرانەدا، کە کاری لێ نەکرا بوو، یان پێویستی کتێبخانەی کوردی بوون. بێگومان ئەم قسەیە پێویستی بە سەلماندن هەیە، کە لەم نووسینەدا بە وردبوونەوە لە بەرهەمەکانی هەوڵی ئەوە دەدەین.




## نووسینەکانی عەزیز گەردی

سەرەتا دەبێت بڵێم سەرەتای ئاشنابوونی من لەگەڵ عەزیز گەردی لە ڕێی کارە وەرگێردراوەکانییەوە نەبوو، بەڵکو لە ڕێی کتێبێکەوە بوو بەناونیشانی "ئەدەبی بەراوردکاری" ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ و گرنگە سەبارەت بە میتۆدی بەراوردکاری لە نێوان دوو تێکستدا، کە لێکۆڵەران وەک میتۆد دەتوانن بۆ بەراوردکردنی دوو تێکست لە دوو زمانی جیاوازدا بەکاری بهێنن. من ئەم میتۆدەم لە لێکۆڵینەوەیەکدا دە ساڵ لەمەوبەر بەکارهێناوە و سەرچاوەی سەرەکیشم ئەم کتێبەی عەزیز گەردی بوو. یەکێکی دیکە لەو کتێبە دانراوەکانی ئەم زاتە "ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی"یە، کە کتێبێکی قەبارە گەورەیە سەبارەت بە کێشی شیعریی کلاسیکی و یەکێکە لە سەرچاوە دەگمەنەکان. ئەمە بێجگە لە سێ نامیلکەی "ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا"، کە ئەمانیش لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا نووسیوە و بڵاوکراونەتەوە. یەکێکی دیکەش لە کتێبەکانی کتێبی "سەروا"یە، کە ئەمیش لێکۆڵینەوەیەکی چڕ و پڕە سەبارەت بە "سەروا" و سەرواکاری لە شیعردا.

ئەمانەی لێرەدا ناویان هێنرا نموونەیەکی بچووکن لە کارەکانی ئەم نووسەرە و خاوەنی چەندین کتێبی

یکەی نووسینە، کە هیچ کتێبێکی نییە کەلێنێکی لە تێبخانەی کوردیدا پڕ نەکردبێتەوە، کە ژمارەی کتێبە ۆوسینەکانی دەگاتە زیاتر لە 20 کتێب، بەڵام لە دوای ۆچی دوایی ئەم نووسەرەوە هەستم بە جۆرێک لە ێئاگایی و نەناسینی ئەم گەردییە بێگەردە کرد. ئەمە ێجگە لەوەی لای هەندێک کەسی دیکەش هەستم بە ۆرێک لە فەرامۆشکردنی بەرهەمە نووسراوەکانی ەم نووسەرە کرد وەکو ئەوەی بەرهەمی وەرگێڕان ایەخدارتربێت لە نووسین. بێگومان من فەزڵی هیچکام ەم دوانە نادەم بەسەر ئەوی دیکەدا، چونکە هیچ ولتوورێک نییە پێویستی بە وەرگێڕان نەبێت، وەک ۆن بەبێ نووسین و بەرهەمی نووسەرانی ناوخۆیی یچ کولتوورێک نییە بتوانێت باسی گەشە و پێگەی ۆی بکات. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە پێویستە وانینمان ڕاست بکەینەوە. تێکست لەسەر بنەمای ڕکاڵی و دەرەکی پۆلێن نەکەین و بڕیاری جوان و ایەخداری نەپێوین، چونکە ئەوەی نەتەوەیەک دەکاتە اوەنی کولتوور و فەرهەنگ بەتەنها وەرگێڕان نییە، ەڵکو وەرگێڕان دەتوانێت هاوکار و دەستگیرۆیکەری ووسەران و بەهرەمەندان بێت بۆ ئەوەی لەنێو هزری ۆماڵی خۆیاندا داهێنان بکەن و تێکستی داهێنەرانە ەفرێنن. پێداگریی دەکەمەوە هیچ میللەتێک نییە بەبێ ووسین شانازی بە کولتوور و بەرەوپێشچوونییەوە کات. کاتێک باسی زمانی ئیتاڵی دەکەین یەکسەر ەیاڵمان دەچێت بۆ لای دانتێ ئەلیگیری و شاکارەکەی کۆمیدیای ئیلاهی" (کە عەزیز گەردی ئەم شاکارەی ردووە بە کوردی) کە توانی بەم تێکستە زمانی ئیتاڵی ە فەوتان بپارێزێت. واتە ئەوەی زمانی ئیتاڵی پاراست ووسینی تێکستێک بوو، نەک وەرگێڕان. کەواتە ەزیز گەردی تەنها بریتی نییە لە کارە وەرگێڕانەکانی کە ئەوانیش سەرمایەیەکی گەورەی زمانەوانی و ۆشنبیریین)، بەڵکو عەزیز گەردی بەر لەوەی وەرگێڕ ێت نووسەرێکی گەورە و داهێنەرێکی بەسەلیقە و ێژەرێکی وردەکار بوو و ئەو بەرهەمانەی لەسەرەوە ناومهێنان و بەرهەمەکانی دیکەشی گەواهیدەری ئەم قسانەن.

یەکێک لە پرۆژە گرنگەکانی ژیانی ئەم نووسەرە کارکردن بوون لەسەر ساغکردنەوەی کێشەکانی عەرووزی عەرەبی لە شیعریی کلاسیکیی کوردیدا. ئەم پرۆژەیە دەمێک ساڵە دەستی پێکردووە و یەکەمجار لە ساڵی 2003دا بەشێک لەم پرۆژەیەی لە دووتوێی کتێبێکی 790 لاپەڕەییدا چاپ و بڵاوکردەوە. دووراودوور ئاگاداربووم کە کار لەم پرۆژەیە دەکات، بەڵام بەداخەوە دوای تەواوکردنی مەرگ مەودای نەدا خۆی چاپکردنەکەی ببینێت.

دوای مەرگی ئەم نووسەرە مەزنە، دەزگای ڤام کتێبەکەیان لە دووتوێی حەوت بەرگدا و بەناونیشانی "ڕابەری کێشی شیعری عەرووزی کوردی" پرۆژەکەیان بۆ بەچاپ گەیاند. نووسەر لە پێشەکی کتێبەکەدا ئەوە دەخاتەڕوو کە "سەرەتای بایەخدانی من بە زانستی عەرووز بۆ سەرەتای حەفتاکان دەگەڕێتەوە، ئەوسا لە ڕێی چەند سەرچاوەیەکی باشی عەرەبییەوە توانیم تا ڕادەیەک لەم زانستە شارەزا بم." دواتر ئەوەش دەخاتەڕوو کە "ئەم ڕابەرە، هەروەکو لە ناونیشانەکەیەوە دیارە تایبەتە بە کێشی شیعری عەرووزی کلاسیکی و تەنیا ئەو شیعرانەی شاعیرەکان دەگرێتەوە، کە بە عەرووزی دەسکاریکراوی عەرەبی هۆنراونەتەوە."

ئەم ڕابەرە (144) شاعیری کلاسیکیی کوردی گرتووەتە خۆ، کە بەشێکیان تا هەنووکەش لە ژیاندا ماون، بەڵام هەر پەیڕەوی لەو کێشە عەرووزیانە دەکەن بۆ نووسینی شیعر. ئەم کتێبە یەکێکە لە سەرچاوە دەگمەنەکانی ناسینی شیعریی کلاسیکی کوردی و ئاشنابوونی خوێنەر بە کێشە عەرووزییەکانیان. ئەمە بێجگە لەوەی نووسەر هەوڵی داوە جۆرێک



له ساغکردنەوەش بۆ کێشە عەرووزییەکان و ڕیشەکانیان بکات.
دەمێک ساڵە خوێنەری شیعریی کلاسیکی کوردیم، بەڵام کاتێک ئەم ڕابەرەم خوێندەوە بە گەلێک لە پەنهانەکانی شیعریی کلاسیکی ئاشنابووم، کە پێشتر هەرگیز نەمزانیبوو. ئەم کتێبە سەرەتایەکی گرنگ و پتەوە بۆ ئاشنابوونی ڕاستەقینە و ئەکادیمیی و زانستیانە بە کێشە شیعرییە کلاسیکییەکان و کێشی عەرووزی عەرەبی.
ناوی عەزیز گەردی ئەگەرچی بێ ئەم بەرهەمەش هەر نەمرە، بەڵام ئەم بەرهەمە نەمرتری کرد. ئەم بەرهەمە کارێکی کرد پرۆژەی لێکۆڵینەوەکانی ئەم نووسەر و ئەکادیمیستە بگاتە کامڵبوون و بەبێ ئەم کارە دەکرا بڵێین پرۆژە ئەدەبی و توێژینەوەکانی کامڵ نین، بەڵام ئێستا خۆشبەختانە بە بوونی ئەم بەرهەمە هەست بە کامڵی پرۆژە مەعریفییەکەی دەکەین.



### وەرگێڕانەکانی عەزیز گەردی

عەزیز گەردی ئەگەرچی یەکەم بەرهەمی کاری وەرگێران نییە، بەڵام کاروانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی هەر لە سەرەتاوە بەدەر نەبووە لە کاری وەرگێڕان. یەکەم کتێب لە ساڵی 1972 سەبارەت بە ڕوانبێژی بڵاو دەکاتەوە و هەر دوو ساڵ دواتر کتێبێکی هاوبەشی وەرگێران بەناوی "سێ گۆشەکان" بڵاو دەکاتەوە. بە وردبوونەوە لە کارە وەرگێڕدراوەکانی دەبینین وەرگێڕان لای گەردی دوو ئاست لە خۆ دەگرێت.
یەکەم: کارکردن لەو تێکستانەی حەز و خولیای خۆی بووە و خۆی حەزی لێی بووە و وەکو جۆرێک لە ئارامی ڕۆحی وەریگێڕاون.
دووەم: کارکردن لەو تێکستانەی پێویستیی کتێبخانەی کوردی بوون، ڕاستە لەگەڵ حەز و خولیای خۆی هاتوونەتەوە، بەڵام پێویستی کتێبخانەی کوردی پاڵنەرێکی بەهێز بوون.
سەرەتای کاروانی وەرگێڕانی ئەم وەرگێرە بە شاکارەکان دەستی پێکردووە. یەکێک لەو کتێبانەی لە ساڵی 1979دا کردوویەتی بە کوردی و چاپ و بڵاوکراوەتەوە داغستانی من-ی ڕەسوڵ هەمزاتوڤە. ئەم کتێبە گەنجینەیەکە لە پەند و چیرۆک، کە نزیکییەکی زۆری لە ڕۆحی مرۆڤی خۆرهەڵاتی و کوردەوە هەیە و ئەم وەرگێڕ هەر زوو پەی بەو نزیکییە دەبات و دەیکاتە کوردی.
یەکێکی دیکە لەو کتێبانەی کە بەلای منەوە جێگەی بایەخێکی گەورەیە کتێبی "کۆمیدیا"ی دانتییە. ئەم کتێبە نەک شاکاری ئەدەبی ئیتاڵییە، بەڵکو یەکێکە لە تێکستە دایکانەکانی نێو ئەدەبیاتی کلاسیکی جیهانی و لەسەر دەستی گەردی کراوە بە کوردی.
کاتێک باس لە تێکستی دایکانە دەکەین مەبەستمان ئەو تێکستانەن کە لە هەناویانەوە دەیان تێکستی دیکە هاتوونەتە دەرەوە، یان کاریگەرییان لەسەر دەیان تێکست داناوە لە چەشنی ئیلیادە و ئۆدیسەی هۆمیرۆس، میتامۆرفۆس-ی ئۆڤید، زنجیرە چیرۆکی "هەزار و یەک شەو". هەڵبەت "کۆمیدیا" لە ڕیزی ئەو تێکستانەیە.
یەکێکی دیکە لە وێستگەکانی کاری وەرگێڕانی ئەم نووسەر و وەرگێڕە، وەرگێڕانی ئەو کتێبانەیە کە ڕۆژهەڵاتناسان و ئەکادیمیستانی بیانی سەبارەت بە کورد نووسیویانە، کە دەتوانم دوو نموونەی گەلێک گرنگ بیری خوێنەر بخەمەوە لەوانە: "ژیانی ئافرەتی کورد/ نووسینی هێنری هارۆ هانسن"، "ئافرەتی کورد لە تورکیا/ نووسینی لویس گارنێت". ئەمە دوو نموونەی گەلێک گرنگ و بەپێزن لەم بواری وەرگێڕانەی گەردی بەسەر کردووەتەوە.

یەکێکی دیکە لە پرۆژەکانی وەرگێڕانی گەردی کارکردن بوو لە کۆبەرهەمی نووسەران و بۆ ئەم مەبەستەش کاری لەسەر کۆبەرهەمی چەند نووسەرێک کرد، کە بەداخەوە هیچیانی بە کۆتا نەگەیاند لەوانە: "لیۆ تۆڵستۆی"، "ئۆریانا ڤالاچی"، "عەلی ئەشرەف دەرویشیان"، "مەنسوور یاقووتی" و "زەکەریا تامر"، کە ئەمەی دواییان تەنها یەک دوو کتێبی بەچاپ گەیەنرا و ئەوەندە من ئاگادار بم بەشێکی دیکە لە کتێبەکانی وەرگێڕانی تەواو کردووە و بە چاپ نەگەیشتووە.

یەکێکی دیکە لە توانابییەکانی ئەم وەرگێڕ کارکردن بووە لە بواری وەرگێڕانی پێچەوانە. بەداخەوە لەم بوارەدا بەهۆی ئەوەی هاندان نەبوو تەنها یەک کتێبی بەچاپ گەیاند کە ئەویش "مەموزین"ی ئەحمەدی خانی بوو. لێرەدا کە باس لە هاندان دەکەم مەبەستم ئەوەیە کە دەزگایەکی نیشتمانی نییە کار لەسەر وەرگێڕانی پێچەوانە بکات و تارادەیەک وەرگێڕانی پێچەوانە بکاتە سیستماتیک و ئەو بەرهەمانی وەرگێڕکاران لە کوردییەوە بۆ زمانانی دیکە وەری دەگێڕن هەوڵەکە بە فیڕۆ نەڕوات و بە خوێنەرانی ئەو زمانانە بناسێنرێت و دەزگای چاپی متمانەپێکراویان بۆ بدۆزرێتەوە، کە لای ئێمە تا هەنووکە ئەم دەزگا نیشتمانییە نییە. هەر بۆیە وەرگێڕانی پێچەوانە جگە لە هەوڵێکی تاکەکەسی و خەمخۆری خودی وەرگێڕ هیچی دیکە نییە بۆیە دەیان ئاستەنگی جۆراوجۆری بۆ دروست بووە و هاوکات لەبەردەمیشدایە.

بەدەر لەوەی لە پێشتر سەبارەت بە وەرگێڕانەکانی عەزیز گەردی خرایەڕوو، یەکێکی دیکە لە وێستگە گرنگەکانی وەرگێڕان لای ئەم نووسەر و وەرگێڕە، وەرگێڕانی چیرۆکی ئەفسانەییە، یان دروستتر بڵێم ئەفسانەی گەلانی دونیایە. کە نزیکەی 50 کتێبە. ئەفسانەکان جگە لە ئەفسانەی کوردی، ئەفسانەی گەلان و ناوچەی جیا جیای دیکەی جیهانی تێدایە، کە لە ئەفسانەی چینییەوە دەست پێ دەکات تا ئەفسانەی ئەفریقی و ئەڵمانی.

بێگومان بوونی ئەفسانەکان گوزارشتن لە بیرکردنەوە و چۆنێتیی ژیان و کولتووری ئەو گەل و ناوچانەی کە لێی ڕسکاون. بوونی ئەم ئەفسانانە، کە من بە "ئەفسانەکانی عەزیز گەردی" ناویان دەبەم، گەلێک بایەخدارن بۆ خوێنەری کورد. هەر گەلێک دوور بێت لە ئەفسانەخوێنی و دونیابینیی نەوەکانی کورت و خەیاڵدانی خاڵی دەبێت. ئەم ئەفسانانە دەشێ کاریگەریی گەلێک گرنگ لەسەر دونیابینیی خوێنەری کورد دابنێت و ڕەنگدانەوەشی لەسەر هونەری گێڕانەوەی کوردی هەبێت.

عەزیز گەردی، ئەگەرچی بە جەستە لامان نەماوە، بەڵام کتێبەکانی کە زیاتر لە 100 کتێب و چەند هەزار لاپەڕەیە، بۆ هەمیشەیی لای نەوە دوای نەوەی خوێندەوارانی کورد دەمێنێتەوە و کاریگەریی نووسین و وەرگێڕانەکانی هەمیشە بە نەمری نەمێننەوە.



# پیاوی شاکارەکان

کارزان عەلی

لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، کە ناوی وەرگێڕان دەبرێت و قسە لەسەر گرنگی و هەڵبژاردنی کتێب و شاکارە جیهانییەکان دەکرێت، ڕاستەوخۆ ئێمە پشت بە یادگەی خۆمان دەبەستین بۆ ڕیزکردنی ناوەکان. نەک تەنها لەم چەند ساڵەی دواییدا، بەڵکو لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە، بەر ناوی نووسەر و وەرگێڕێک دەکەوین، کە وەک تاقانەوەرگێڕی شاکارەکان دەتوانم ناوی بهێنم ئەویش مامۆستا عەزیز گەردییە.

من نامەوێ گرنگی ئەم پیاوە لەو وێنەیەدا ڕوون بکەمەوە کە تەنها لە بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانیدا هەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە شێوازی ئیشکردن و هەڵبژاردنی بابەتەکان لای ئەم پیاوە دەکرێت بە دوو ئاراستەی جیاوازدا خۆی دەربخات.

یەکەمیان: پەرژان و تەرخانکردنی ڕووبەرێکی زۆری کارەکانی بۆ نووسین، بەڵام نووسینێک کە ڕەگێکی قووڵی بەناو ئەدەبیاتی کلاسیکی ئێمەدا کێشاوە، ئەویش قسەکردن و نووسینە لەسەر ڕەوانبێژی و کێشی پەنجە، کە بناغەی بەکارهێنانەکەی شیعری کلاسیکی کوردییە بە تایبەتی.

ئاراستەی دووەم کە ئەمەیان زیاتر جەختی لەسەر دەکەینەوە، لەبەر ئەوەی مامۆستا عەزیز گەردی، جگە لەوەی زۆر بە دڵسۆزی و وەفادارییەوە کاری لەسەر کردووە، بەڵکو بە شارەزاییەکی کەموێنەشەوە هەوڵی داوە لەسەر ئەو بەرهەمانە بوەستێت و وەرگێڕانیان بۆ بکات، کە پایەوپلەیەکی جیهانییان هەیە و لە ئاستێکی بەرزی خوێندنەوەدان، ئەوەی وا دەکات لەم خاڵەدا زیاتر ڕۆ بچین، زیندوویێتیی ئەو کتێب و شاکارانەیە ئەم پیاوە ئیشی لەسەر دەکات، لێرەوە گەر بۆ نموونە (کۆمیدیا)ی ئەلیگری دانتی وەربگرین، پێدەزانین کە مامۆستا گەردی زۆر بە وریایی و شارەزایی خوێنەرێکی بەسەلیقەوە، کتێبەکانی هەڵبژاردووە بۆ وەرگێڕان. لێرەوە دەگەینە ئەنجامی ئەوەی کە عەزیز گەردی جگە لەوەی وەرگێڕێکی پڕئەزموون و دەگمەنی کوردە، خوێنەرێکی شارەزا و پڕئەزموونیشە لە بواری کتێب و شاکارە جیهانییەکاندا. بە شێوەیەک گەر سەیری کۆی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی مامۆستا بکەین، پێش ئەوەی وەرگێڕانی شاکارەکە خۆشحاڵمان بکات، ناوبانگی جیهانی کتێبەکە ڕامان دەگرێت. جگە لەوەش، هەر بە پۆلێنکردنی کۆی کارە وەرگێڕدراوەکانی دەبینین کەم نووسەری جیهانی هەیە ئەم پیاوە نەپەرژابێتە سەر یەکێک لە بەرهەمەکانی، کە ئەمەیان هەست دەکەم بۆ هەڵبژاردنی کتێبەکانی نییە لەم دواییانەدا، بەڵکو درێژکراوەی هەمان ئەزموونی ناو یادگەی ئێمەی خوێنەرە کە لە زنجیرە کتێبەکانی (ئەدەبی بێگانان)ەوە دەست پێ دەکات. لەوێدا ئێمە بەر نووسەرانێکی گەورەی ڕووسی و چیرۆکەکانیان دەکەوین، بەر نووسەرانێکی گەورەی جیهانی و بەرهەمەکانیان دەکەوین، ئەم خاڵەیە وا دەکات کە ئێمە عەزیز گەردی، وەک درێژبوونەوە و بەردەوامیپێدان بە ئەزموونێکی پڕکار و پڕبەرهەم ناوزەند بکەین، چونکە هەنگاوە یەکەمینەکانی لە (ئەدەبی بێگانان)ەوە دەست پێ دەکات و لەو کاتەدا، دەست دەبات بۆ نووسەرانێکی جیهانی، کە نەک تەنها لە ناوەندی خوێندنەوەی کوردی زماندا، بەڵکو تەنانەت بۆ عەرەبەکانیش تازە بوون.

ئەم ئاراستەیەی دووەمی کارکردنی مامۆستا، درێژەی دەبێت، بەردەوامی پێ دەدات و لە کارێکدا ناوەستێت. لێرەوە دەتوانین بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی مامۆستا، لقێکی تری لێ زیاد بکەین، ئەوەش شێوازی کارکردنی دەکات بە دوو بەشەوە، یەکەمیان (وەک گوتمان) شاکارە جیهانی و نوێیەکان، کە خۆی لە کۆی ئەو ڕۆمان و چیرۆک و شیعرانەدا دەبینێتەوە و ڕووبەرێکی فراوانی کارەکانی دەگرنەوە، دووەمیان گەڕانەوەیەتی بۆ ئەفسانەی گەلان.

ئەم شێوازی کارکردنە بەم دوو لقە جیاوازەی وەرگێڕاندا، لە ئاستێکی زۆر



باڵای هۆشیاری خوێندنەوەدایە.
ئەگەر هەموو ئەم ئیشکردنە لە خاڵێکدا کۆ بکەینەوە، دەبینین ئیشکردنی عەزیز گەردی بە کۆ، دەستێکی باڵای لەناو ڕاڤەکاری هونەرەکانی ڕەوانبێژیدا خستووەتە کار، لە هەمان کاتیشدا ئاراستەی وەرگێڕانەکانی بە دووڕێی جیاوازدا دەبات، یەکەمیان بەرهەمی ڕۆمان و چیرۆک و ئەدەبیاتی مۆدێرن، دووەمیان هەڵدانەوەی مێژوویەکی گەورەی خەیاڵدانی نەتەوە جیاوازەکان، ئەمەش لەو بەرهەمە ئەفسانەییانەدایە، کە وەرگێڕ کردوونی بە کوردی.
گەر سەیری مێژووی وەرگێڕانی کوردی بکەین، بە دەگمەن وەرگێڕێک بەم تایبەتمەندی و شارەزاییەوە بەردەست دەبێت، چونکە ئاستی توانا و شکاندنەوە و هێزی عەزیز گەردی، و پێڕاگەشتنی بەم ئاستە باڵایە بۆ کتێبە وەرگێڕدراوەکانی، لە ئاستی دەزگا و دامەزراوەیەکی فراواندا و بە کۆمەڵێک وەرگێڕی بەتواناوە، نەک تەنها یەک کەس، کە ئەمەش گرنگی و ئەرزشی ئەم پیاوە و دڵسۆزی بۆ کارەکەی دەردەخات

***

وەکو ئەزموونی خوێندنەوەی کەسینەییم، یەکەمین کتێبێک کە وەک کتێبە سەرەتاییەکانی یادگەی خوێندنەوەم سەیری دەکەم، تاقیکردنەوە و ژیان بوو لەگەڵ دێڕبەدێڕ و بەسەرهاتە ئەفسانەئامێزەکانی (داغستانی من)ی ڕەسووڵ هەمزاتۆڤدا، هەردوو بەرگی ئەم کتێبە، هاوکات لەگەڵ سەرەتاکانی خوێندنی ناوەندییمدا، یەکێک بووە لەو دەقانەی هەمیشە هەستم کردووە پەلکێشم دەکات، بە شێوەیەک کە لە کتێبەکانی ناوەندی خوێندن زیاتر گرنگیم پێ دەدا. تەنانەت ئەو ناوەی کە هەمیشە دەگەڕامەوە سەری و بە دوایدا دەگەڕام، نە (داغستانی من) و نە (هەمزاتۆڤ) بوو، بەڵکو وامدەزانی خەیاڵە بەهێزەکانی، گێڕانەوە سیحریی و زمانە تایبەتییەکەی (عەزیز گەردی)یە، ئەم دێڕانەی نووسیوە، گەر بە چاوی ئێستا سەیری ئەو دەقە بکەمەوە، زیاتر جەختی لەسەر دەکەمەوە کە ئەوە سیحری وەرگێڕان و قووڵبوونەوەی مامۆستا گەردی بوو ئەو کتێبەی کردە یەکێک لە گرنگترین خوێندنەوەکانی ناو یادگەی ئێمە، زمانێک کە هەستت دەکرد، پیاوێک، یان ژنێکە و بە زمانی کوردی حیکایەتت بۆ دەگێڕێتەوە، وەک حیکایەتی داپیرەکان.
بە ئێستاشەوە، ئەو زمانە کوردییە پەتییەی مامۆستا، یەکێکە لە کاریگەرترین ئامرازەکانی خۆشەویستکردنی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی لای خوێنەر.
ئەوەی دەمەوێ لەم کورتەوتارەدا جەختی لەسەر بکەمەوە، کارێکی ناوازەیە کە بەڕاستی بە ئێستاشەوە کەم وەرگێڕی ناو دونیای ئەدەبیاتی ئێمە دەتوانێت بیری لێ بکاتەوە. یەکێکە لە بەهێزترین خاڵەکانی کاروانی پڕئەزموونی مامۆستا گەردی، ئەوەش بیرکردنەوەیە لەوەی کە کۆکاری نووسەرێنێک بکاتەوە بە کوردی. بە مەرجێک ئەم هەنگاوە جگە لەوەی ئەرکێکی پیرۆزە و وەرگێڕ دەیخاتە سەرشانی، جگە لەوەش کە کەم کەس خۆی لە قەرەی دەدات، بەڵام مامۆستا گەردی، ئەم هەنگاوە بە بوێرییەوە دەنێت، دەبێتە یەکەمین وەرگێڕی ناو جیهانی ئەدەبیاتی کوردی کە بیر لەم شتە بکاتەوە، ئەویش دەستبردن و وەرگێڕانی کۆکاری نووسەرانێکی ناودار و بەناوبانگی کوردزمانە، کە بە هەندێک هۆکاری تایبەتی، بڕیار دەدات پەنا بباتە بەر زمانی فارسی و ڕۆمان و چیرۆکەکانی هەر بە فارسی بڵاو بکاتەوە، ئەویش: (عەلی ئەشرەف دەروێشیان)ە.
دەروێشیان بە کاریگەریی ئەو سەردەمەی تێیدا













ژیاوە (1941 ـ 2017)، بە کاریگەریی سەرھەڵدان و دروستبوون و ژیان لەگەڵ شۆڕش و ڕاپەڕین و نوخبە سیاسییە نالەبارەکانی ئێرانی ئەو سالانەدا لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی خۆی کەسێکی چالاک و بوێر دەبێت و بەشدارییەکی چالاکی ئەو ڕاپەڕین و بەرخۆدانەی ڕۆژھەڵات دەکات، دواتریش زۆرینەی ئەو دۆخ و دۆزە سیاسی و ئابوورییە سەختەی ئەو کاتەی شارەکانی کوردستان و بەتایبەتی ناوچەی کرماشاندا تێیدا ژیاوە، خاوەنی وێناکردنێکی تایبەت و قووڵبوونەوەیەکی جیاواز بووە، بۆ ئەمەش زۆرینەی بەرھەمەکانی باری سیاسی، دۆخی سەختی ھەژاری لەو سەردەمەدا دەنووسێت، کە ئەمەیان دەیکات بە خاوەنی زمانێکی تایبەت و نووسینگەلێکی فرەڕەھەند. ئەم زمانە تایبەت و فرەڕەھەندەی دەروێشیان، بە ڕاددەیەکی زۆر لە توانست و ھێزی وەرگێڕێکی لێزان و شارەزادایە کە بوێرێت دەست ببات بۆ بەرھەمەکانی، چونکە زمانی عەلی ئەشرەف، لە لایەکەوە، زمانێکە لە ھەناوی کۆمەڵگەی پرکێشە و ھەژاری گەڕەکە میللی و ھەژارنشینەکانی کرماشاندا ئیشی پێ کراوە، زمانێکە چەندە ئەدەبییە، ئەوەندەش بارگاوییە بە ئاین و تەلیسم و پاڕانەوە ئاینییەکان، بە کولتووری دواکەوتووی ئەو کاتە کۆمەڵگەی کوردی. لە لایەکی تریشەوە، ھەمان نووسەر، خاوەنی زمانێکی ترە کە زمانی ھێزە نیزامی و پۆلیسییەکانە، زمانی زیندانەوان و زیندانییەکانە، زمانی سەرباز و دەسەڵاتدارەکانە، کە ئەم تایبەتمەندییە کەم کەس ھەیە بتوانێت بە یەکجار ئیش لەسەر وەرگێڕانی بکات.

بەڵام ئەوەی مایەی شانازی کوردزمان و خوێنەری کوردە، پیاوێک بە قەبارەی مامۆستا عەزیز گەردی، ھەر لە سالانی ھەشتاکانەوە، دەست دەکات بە



وەرگێڕانی چەند کۆمەڵەچیرۆکێکی دەروێشیان، بە ناوی (وەرزی نان).

دواتر ئەم عەشقەی مامۆستا گەردی بەردەوام دەبێت، ئەزموونی ناوازەی زمانزانینی خۆی لە وەرگێڕانی دوو بەرهەمی تری هەمان نوسەردا دەخاتەوە کار، ئەزموونێک کە گومان دەکەیت خودی نووسەر دەروێشیان ئەم چیرۆکانەی بە زمانی کوردی نووسیبێت، لەبەر ئەوە دوو کۆمەڵەچیرۆکی تری دەکاتەوە بە کوردی بە ناوی (قەڵەم قامیش) و (ئابشۆران) و... بڵاوی دەکاتەوە.

لێرەوە قۆناغ و بڕیارێکی گرنگی ئەزموونی وەرگێڕانی مامۆستا عەزیز دەست پێدەکات، وەک لە دێڕەکانی سەرەوەدا ئاماژەم پێدا، ئەویش بیرکردنەوەیە لەوەی کۆکارەکانی دەروێشیان بکاتەوە بە کوردی.

لەبەر ئەوە ئێمە لە ساتێکدا چاومان دەکەوێتە سەر وەرگێڕانێکی تری گەردی، کە درێژکراوەی هەمان زمان و سیحری وەرگێڕان، ئەویش وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی کۆمەڵەچیرۆکێکی تری دەروێشیانە بە ناوی (چیرۆکێن ناو بەندینخانە)، ئەوەی لێرەدا گرنگە لە سەری بوەستین، ئەو توانایەی وەرگێڕانە کە گەردی لەم کتێبەشدا پێشکەشی دەکات، چونکە جگە لەوەی ناونیشانی دەقەکە دەکات بە (چیرۆکێن) کە ئەمەش لادانە لە زمانی باوی وەرگێڕان، کە دەکرا بە (چیرۆکەکان)، یان هەر ناونیشانێکی تر بیکردایە، ئەم لادان و جوانکارییە زمانەوانییە لەناو خودی "چیرۆکێن" ئەم کتێبەدا زیاتر ڕەنگ دەرێژێت، جگە لەوەی کە زۆر بە وریاییەوە لە زمانی چیرۆکێن (وەرزی نان، قەڵەمی قامیش و ئابشۆران) جیاوازترە و فەزای چیرۆکەکانیش جیاوازە.

لە یەکێک لە گرنگترین وێستگەکانی ژیانی پڕبەرهەمی مامۆستا گەردیدا، ئێمە شاکارێکی تری گێڕانەوەی چیرۆکنووس عەلی ئەشرەف دەروێشیان، بە زمانێکی بەهێز و وەرگێڕانێکی پرۆفیشناڵانە دەخوێنینەوە، گێڕانەوەیەک کە لەناو ژوورێکی زینداندا ڕوو دەدات، بە هەموو شێوەیەک لە ڕووی زمانی چیرۆک، دیمەن، گۆشەنیگا و بنەماکانی تریەوە جیاواز و کەموێنەیە، ئەویش نۆڤلێتی (سلوولی 18)یە. لێرەدا زمانی گەردی بە شێوەیەک ورد و دیققەتی دەقەکە دەپارێزێت، هەست بەوە ناکەیت وەرگێڕان دەخوێنیتەوە، بەڵکو هێندە ورد زمانەکە دەکاتەوە بە کوردی، وەک ئەوەی وێنەکان لەبەر چاوی خوێنەردا بە ڕاستەوخۆ ڕوو بدەن.

ئەم پیاوە بەم پرۆژەیەشەوە ناوەستێت، وەکو کاری لەمێژینەی خۆی، کە من دەتوانم ناوی بنێم پیاوی وەرگێڕانی شاکارە جیهانییەکان، دەست دەبات و بۆ دوایین جار، بەرزترین شاکاری عەلی ئەشرەف دەکاتەوە بە کوردی، کە ئەمەیان یەکێکە لە گرنگترین هەنگاوەکانی ژیانی وەرگێڕانی مامۆستا گەردی بۆ وەرگێڕانی کۆبەرهەمەکانی دەروێشیان، ئەویش وەرگێڕانی ڕۆمانە چوار بەرگییە قەبارە گەورەکەی، واتە ڕۆمانی (ساڵانی هەورین).

(ساڵانی هەورین) بە گرنگترین کاری دەروێشیان دادەنرێت، نەک لەبەر ئەوەی کارەکانی تری گرنگ نین، نا، بەڵکو لەبەر ئەوەی بەسەرهاتی دوو نەوەی یەک لە دوای یەکی سەردەمی دەسەڵاتی ڕەزا شای پەهلەوی لە دووتوێی چوار بەرگی قەبارە گەورەدا دەگێڕێتەوە. چ لە ڕووی فۆرم و چ لە ڕووی ناوەرۆک و نووسینەوە، چ لە ڕووی گێڕانەوە و کارەکتەرسازی و دایەلۆگەوە، ئەم شاکارە کارێکی ناوازەیە، کە ئەمەیان بۆ توانا و دەسەڵاتی خودی دەروێشیان دەگەڕێتەوە لە چنینی دەقەکەدا، بەڵام

وەکو وەرگێران، من بە گرنگترین کاری وەرگێرانی ئەزموونی پڕبەرهەمی مامۆستا گەردی دەزانم، چونکە بە شێوەیەک لەگەڵ ئەم دەقەدا دۆنادۆن دەکات، بە شێوەیەک شێوەی ڕیتمی زمان و ئاستەکانی دەپارێزێت، کە هەر لە خۆی دەوەشێتەوە. ئەم وەرگێڕانە من هەندێک جار وەک فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی زمانی کوردی لێی دەڕوانم، چونکە لە دووتوێی ئەو دوو بەرگەی کە مامۆستا گەردی کردوویەتی و بەداخەوە لەوانەیە تەمەن ڕێگەی ئەوەی نەدابێ دوو بەرگەکەی تری بکاتەوە بە کوردی، ئێمە بەر هەموو زار و بن زار و لقەکانی تری زمانی کوردی دەکەوین. لە هەندێک جێگەی ڕۆمانەکەدا، وەرگێڕ بە چەندین شێوە زار و وشەی فەرامۆشکراوی ناو زمانی کوردی ئاشنامان دەکاتەوە.

لەوەش گرنگتر، وەرگێڕ بۆ بیرهێنانەوە، لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا فەرهەنگی هەموو وشە نامۆکانی ناو دوو بەرگەکە بە دوای یەکدا ڕیز دەکات و دەینووسێتەوە. چ دوو بەرگی ڕۆمانەکە و چ فەرهەنگۆکی کۆتایی ڕۆمانەکەش، دەری دەخات مامۆستا عەزیز گەردی، یەکێکە لە بەهێزترین کۆڵەکەکانی وەرگێران لە ئەدەبی کوردیدا، گەر لە سەرووی ئەو هەرەمەدا نەوەستابێت مێژووی وەرگێران لەم زمانەدا بونیادی ناوە.



# سوڵتانی کتێب... عەزیز گەردی

نەجات نوری



ەو سوڵتانە بێدەنگەی کە هیچ نووسەرێکی تری ێمە وەکو ئەو نەبوو، لەناو هەزاران دەنگەدەنگ و اتوهاوار و پێکداهەڵپڕژاندا، لەگەڵ هەموو جەنگ و ێڵایەکانی ژیاندا، عەزیز گەردی تەنیا پشتوپەنایی کتێب ی ژیانە سادەکەی خۆی بوو، هیچ شتێکی لە ژیاندا بە کتێب نەدەگۆڕییەوە، بیری لە نان و دەسەڵات و پلە و خۆشگوزەرانی نەدەکردەوە، تاکە سۆفی ڕێگەی هەقی کتێب ئەو بوو، لە کەشکۆڵی تەمەنی پڕ لە خەڵوەت ی بێدەنگیدا لە ساڵی شەستەکانەوە وەکو سوڵتانێکی بەهەیبەت و لەخۆبووردوو بەبێ لەخۆباییبوون کتێبی کردە بەردەبازی بیری هەزاران خوێنەر، بەو زمانە پاراو و بەنرخەی خۆی لە پشت دەیان ئەفسانە و کۆمیدیا و چیرۆک و ڕۆمانەوە ئێمەی خوێنەرانی بردە ناو ئەو قەڵا ونبوانەوە کە ئەو دەیویست تێدا بە حەقیقەتی ئەدەب بگەین وەکو تاکەڕێگەی ڕاستی.

لەناو ئێمەدا ئەوەی بۆ کتێب ژیا و لەپێناویشدا مرد بە هەق مرۆڤێک بوو جیا لە هەموو نووسەرانی تر ناوی عەزیز گەردی بوو، ئەو سوڵتانێک بوو بەدەر لە وشە لە ژیاندا هیچی تری نەدەویست، قەڵای ئەم سوڵتانە بێدەنگە بە هەزاران لاپەڕەی پەنجا کتێب هەڵچنرابوو کە خۆی نووسیبوونی، یان وەریگێڕابوون، لەگەڵ هەموو ئەو تەمەنەی کە بەڕێکرد تا تەمەنی بە کتێب سپارد دەیکردە حەفتاوپێنج ساڵ، لەو تەمەندا کە ماڵاوایی دەکات ئەوەی بە جێیهێشت لەشکرێک لەوشە و بە هەزاران خوێنەربوون کە سوڵتانیەتی جوانیی ئەویان بە ڕەفەی کتێبخانەی کوردی سپارد.

کەمن ئەو نووسەر و وەرگێڕانەی وەک عەزیز گەردی کتێبیان کردە ڕووناکیی تەمەنی نەتەوەکەیان، کاتێک بە وردی لە بیر و تێڕوانینەکانی ئەم گەورە وەرگێڕ و نووسەرەی ئێمەوە دەست دەبەین بۆ کاری نووسین و وەرگێڕانەکانی هیچ گومانمان لە لا نامێنێت، کە زۆرکات ئەوانەی بانگەوازی شۆڕش و ئازادی و دادپەروەری دەکەن بەتەنیا جەنگاوەرەکانی ناو کایەی سیاسی نین، بەڵکو ئەو مرۆڤانەیشن، کە وەکو عەزیز گەردی دوور لە هەموو هەلایەکی دەبەنگانە و لەخۆباییانە دێن بە وشەی کتێبەکان دەرگای بیری ئازادی و شۆڕش لەسەر گەلانی خۆیان واڵا دەکەن و بە هەیبەتی کتێب و بە هێزی وشەکان داوای گۆڕانکاری و بەرپاکردنی عەقڵ و هێنانەدی ژیانێکی نوێ بۆ تاک بەتاکی میللەتەکەیان ڕادەگەیەنن.

ئاوا عەزیز گەردی ئەو پیاوە بلیمەتە بوو لە بەرگی سۆفییەک یان سوڵتانێکی بێدەنگدا هەموو ژیانی خۆی بۆ کتێب تەرخان کرد بەبێ ئەوەی هیچ منەتێک بەسەر کەسدا بکات، ئەو کتێبانەی کە ئەو دەیویست ببنە ناوێک بۆ هەڵتەکاندنی بیری تاریکی و گەمژەکارانە، لە ڕێگەی لاپەڕە و ماناکانی ناو کتێبەوە ئەو هات هەر خۆی دوور لە هیچ پشت و پەنایەک قەڵایی ئەو جانەوەرانەی تێکشکاند کە دەیانویست کتێب هیچ سەنگ و گرنگییەکی نەبێت، کتێب بۆ عەزیز گەردی ئەو هێزە شاراوەیە بوو کە دەیویست بەکاری بهێنێت بۆ هەڵتەکاندنی زۆر بابەتی لاوەکی و کولتووری دواکەوتووی و دابڕان لە عەقڵی سەدە تاریکەکان، ئەو پیاوەی کە لەژێر بیرێکی قووڵدا دەیویست خوێنەران بە مانا و حەقیقەتی وشەکان بگەن، ئەو گۆڕانکارییانەی ئەو دەیویست بیانهێنێتە کایەوە لەناو خەڵک و خوێنەراندا لە ساڵی شەستەکانەوە دوور لە هەموو پێکدان و شەڕەقسەیەک، گەیشتن بوو بە ماناکانی ناو کتێب، ئاوا بە کتێب دەرگای لەسەر بیری خوێنەران دەکردەوە و هەموو ساڵێک بە لەچاپدانی ئەم کتێب و ئەو کتێب، دەهات خوێنەرانی بۆ دەیان بابەتی جۆراوجۆر پەلکێش دەکرد، ئەو کاتێک دێت چیرۆکی بەرئاگردان وەردەگێڕێت لەخۆڕا نییە کە دەرگایەکی ئاوا دەخاتە سەرپشت، لە پشت ئەم چیرۆکانەوە دەیەوێت بە خوێنەرانی وڵاتەکەی بڵێت ئێمە نەتەوەیەکین نەک خۆمان بەڵکو چیرۆک





و ئەفسانە و کولتووریشمان خراپ داگیرکراوە، خۆ لەخۆڕا نییە کاتێک ئەم پیاوە بلیمەتە دێت بە دەیان چیرۆکی بەرئاگردان و ئەفسانەی خۆمان و ولاتانی ترمان بۆ دەهێنێتە سەر زمانی کوردی، لە پشت هەر ئەفسانە و چیرۆکێکەوە ئەو دەیەوێت دەرگای حەقیقەتێکمان بەسەردا بکاتەوە، کە لێوەی فێری زانین و ڕۆشنبیری و ڕاستییەکان ببین. ئەو نەهات وەک کەسانی تر بە جەنگی ئاگرین و پێکدادان بۆ گۆڕانکاریی بە جەستە و ڕۆحی کەسانی تر دەستت ببات بۆ هەڵتەکاندنی بەربەست و قەڵای جانەوەرەکان، ڕێگەی و بیری عەزیز گەردی زۆر جیاوازبوو لەم نەخشانە، ئەو نەخشەی خۆی هەبوو، جەنگی ئەو جەنگێکی بێدەنگ بوو، لە قووڵایی کتێبەکانەوە سەری هەڵدەدات، ئاوا بەو شێوەیە خۆی گەیاندە ئاست ئەو بلیمەتانەی کە دەیانویست بە بیری ناو کتێبە جۆر بە جۆرەکان قۆناغی گۆڕانکاری کۆمەڵ بەرەو ئاراستیەکی تر بەرن لەوەی کە هەیە.

هیچ کەسێک نییە لەخۆڕا کتێب بنووسێت یان وەریبگێڕێت ئەگەر بیر لە فیکر و وەرچەخان نەکاتەوە، ئاوا عەزیز گەردی لە ڕێگەی وەرگێڕانی "داغستانی من" و "ڕۆمیۆ و جولێت" و "ئەگەر خۆر بمرێت" و "حەفت گفتوگۆ"وە تا بە وەرگێڕانی دەیان کتێبی ئەفسانەی گەلان و چیرۆکی بەرئاگردان و کۆمیدیای دانتی دەگات، لە پشت هەر یەکێک لەم کتێبانەوە لە پەنا هەر دێڕێکیان و لە ناو قووڵایی شاراوەی لاپەڕەی هەر کەسایەتییەک و پاڵەوانیەکیاندا ئێمەی خوێنەران بۆ دەیان باس و بیرگەورە و جوانی و مەرگ و عەشق و ستەم و بێ دادی پەلکێش دەکات، بۆ هەر یەکێک لەم کتێبانە ئەم سوڵتانە بێدەنگە لە قەڵای ڕووناکیی بیری خۆیەوە دەیەوێت ئێمەی خوێنەران و خەڵکی تریش بەو ئاماژە گەورانە بگەیەنێت، کە ئێمە وەک نەتەوە و تاک زۆر پێویستیمان پێیانە، ئەو وێنانەی ئەو لە هەردوو بەرگی داغستانی من و کۆمیدیای دانتی و کتێبی گفتوگۆ لەگەڵ مێژوودا دەیانخاتە ڕوو، وێنەگەلێکنین بۆ کاتکوشتن و خوێندنەوەیەکی لاوەکییانە، بۆ ئەم سێ کتێبە بە دەیان پرسیار لە ڕێگەی ناوەڕۆکیانەوە بۆ ئێمە دەخاتە ڕوو، کە گرانە وا زوو ئێمە بتوانین وەڵامیان بدەینەوە، لەم سێ کتێبەدا (عەقڵ و ستەم و خورافە) پێکەوە دەخرێنە ڕوو، ئەو دێت لە بنەچەوە بە وەرگێڕانی ئەم سێ کتێبە دەست دەبات بۆ ئەو بیروباوڕانەی، کە چەند عاقڵانە و نامۆیانە و ستەمکارانە لە ڕۆژگارە جۆراوجۆرەکاندا بەرۆکی خەڵکیان گرتووە، عەزیز گەردی زۆرباش دەزانێت بۆچی ئەم سێ کتێبەی وەرگێڕاوە و چی لەپشت ناوەڕۆک و مانا و وێنەکانیانەوە خۆی حەشارداوە، بۆ هەر یەکێکیان ئەو ئێمە دەخاتە بەردەم دەیان پرسی گرنگ و لێکئالاو، دەیەوێت بۆ هەر یەکێکیان ئێمە وەڵاممان هەبێت و لەوەدا نەمێنینەوە بەتەنیا خوێندنەوە بەس بێت، لە گرنگی ئەم سێ کارەیەوە دەبێت خوێنەران باش ئەوە درک پێ بکەن کە کاتێک لە زمانی دانتیەوە لە کۆمیدیادا دێتە سەر باسی دۆزەخ و دەنووسێت:

**بە ڕێی مندا دەچن بۆ ناو شاری ئازار**
**بە ڕێی مندا دەچن بۆ ناو ئەشکەنجەی هەمیشەیی**
**بە ڕێی مندا دەچن بۆ ناو خەڵکی سەرگەردان...**

**یان لە داغستانی مندا لە تێڕوانینی ڕەسووڵ هەمزەتۆڤەوە ئاوا دەدوێت:**

**مەلۆتکەیەك لێرەدا پێدەکەنێ و دەگری**
**هێشتا قسەی پێ ناکرێ**
**بەڵام بەمزوانە باسی دەکا**
**کێیە و بۆچی هاتووەتە دونیاوە**

کاتێکیش لە کتێبی گفتوگۆی ئۆریانا فالاچی لەگەڵ 16 دەسەڵاتداری جۆربەجۆردا لە جیهاندا، بە نهێنییەکانی سیاسەت دەگەین، کە ستەم چۆنچۆنی جیهانی پەکخستووە، لەم وێنانەوە بە قووڵایی ئەو مانایانە دەگەین کە لەم سێ کتێب جۆربەجۆرەدا بیرکردنەوەی ئێمەی خوێنەران بۆ بیری عەزیز گەردی پەلکێش دەکات، بەم سێ کتێبە و بە وەرگێڕانیان ئێمەی خوێنەران زۆرباش درک بە قووڵایی عەقڵ و تێڕامانەکانی عەزیز گەردی دەکەین بۆ جیهان و سیاسەت و خورافە، ئاوا ئێمە وەرگێڕ و نووسەرێکی بلیمەت، یان سوڵتانی کتێبەکانمان لەدەستدا، کە دەمێک ساڵ بوو دەیویست بە ڕێگەی کتێبدا میللەتێک بەرەو گۆڕانکاری بەرێت، ئاوا سوڵتانی کتێبەکان مرد، کە بێدەنگ دەیویست لە قەڵای وشەکانییەوە تاک بە تاکمان بخاتە سەر ڕێگەی حەقیقەت و گەیشتن بە ئازادی.











# ئەو شانەهەنگوینەی لە کتێبخانەی ماڵێکی"چیایی"دا دۆزیمەوە

سلێمان دڵسۆز

ئاخروئۆخری پاییزی ١٩٩٨ بەرهەمی هەنگوینی ئەو ساڵەمم لە ماشێن بار کرد و لە خانێوە بەرەو زاخۆ بەڕێ کەوتم. خۆم لە سنوور پەڕیمەوە و چاوەڕوان بووم هەنگوینەکەم بە مەرزی ڕەسمیدا بۆ ئاودیو بکەن. هەر ئەو شەوە کە گەیشتمە حاجی ئۆمەران بەفر و کرێوە دەستی پێکرد و تا دوو ڕۆژان لێی نەکردەوە. لە سەرێکەوە چاوەڕوانی گەیشتنی هەنگوین و لەو لاشەوە تەمایاری هاتنەوەی کوڕانی خانەخوێکەم بووم کە ماشێنی بارهەڵگریان هەبوو، چووبوونە هەولێر. قەرار بوو ڕۆژی دوایی بگەڕێنەوە و هەنگوینەکەم بۆ بار بکەن. بەیانی لەگەڵ مام عەولای خانەخوێم وەرووەرەمان دەست دانێ و وە سەر بان کەوتین. بۆ چێشتەنگاوێ لە بەفر ماشتن بووینەوە، لە پەنا کوورەی داران نان و چایان بۆ هێناین و حەساینەوە. دوای ئەوە هیچ کارێک نەبوو بیکەم. دەرەوەش کرێوە و سەرمایەک بوو کەس نەیدەوێرا سەر وە دەر نێ. مام عەولا و ژن و منداڵ چوونە ژووری دیکە و من بە تەنیا لە ژوورەکەدا مامەوە. لە وەڕەزییان چوومە بەر پەنجەرە و چاوم لە داوەرینی کلووە بەفرەکان دەکرد کە بە هەزار ڕیتمی جیاواز دادەبارین. دوایی نازانم چۆن بوو کە ئاوڕم دایەوە، لە گۆشەیەکی نیمچەتاریکی وەتاغەکەدا چاوم بە کۆمێدێکی شووشەبەند کەوت. کە لێی چوومە پێش وەک بە سەر خەزێنەیەکدا کەوتبم وا بوو. کۆمێدێک بوو بە چەند ڕەفەوە پڕ لە کتێب! چاوم بە ناونیشانی کتێبەکاندا گێرا، دەیان کتێبی ئەدەبی و دیوانی شاعیرانی کوردی تێدا بوو. لەو نێوەدا ناونیشانێک سەرنجی ڕاکێشام: "داغستانی من". پێشتر زۆرم تاریفی ئەو کتێبە بیستبوو و تەنانەت ناوی وەرگێڕەکەیم دەزانی.

لەگەڵ یەکەم وشە و ڕستەکاندا، کەشوهەوای بەفراوی و کشوماتی ئەو شوێنەم بەجێ هێشت و، بە باڵی سیحریی وشەکانی گەردی فڕیمە دنیایەکی دیکە. وەک ئاگر لە پووشی پووشپەڕ بەربێ، لاپەڕ بە لاپەڕ پێدا ڕۆییم. ئیتر ئاگام لە بەفر و هەنگوین و بارهەڵگر و نان و ئاویش نەما. دیارە پێشتریش کتێب هەبوون دەستیان لێ وەشاندبووم و شێت و خولیای دنیا دەست وێرانەگەیشتووەکانیان کردبووم، بەڵام ئەو کتێبە و ئەو هەستە نیشتمانپەرستییەی لەو کتێبەدا مۆنجی دەدا و ئەو زمانە شیرین و سەلارە ڕەنگینە بێوێنە بوو.

دوای دوو ڕۆژ بەفر لێی کردەوە، دەرک و بان ماشتران. هەنگوینەکە لە سنووری دەستکرد پەڕییەوە. کوڕەکانی مام عەولاش بەخۆیان و بارهەڵگرەوە گەڕانەوە و هەنگوینەمان بار کرد، لە ڕۆیشتندا شانە هەنگوینێکی چەمەری جوانم جودا کردەوە و بۆ خانەخوێکەم بەجێ هێشت کە زۆر پێی خۆشحاڵ بوون. ڕاستە هەنگوینەکە عەسڵ بوو و مێشهەنگەکانم بۆ چێکردنی شیلەی هەزاران گوڵی گوێنیی کوێستانەکانی خانێیان مژیبوو، بەڵام هەر خۆم دەمزانی ئەو هەنگوینەی من لە خەڵەفی کتێبخانە بچووکەکەی ئەواندا دیبوومەوە چەند بەتام و چێژتر بوو.

ئەگەر ئارەشی تیرهاوێژی ئەفسانان شیلەی گیانی خۆی هەموو کۆ کردەوە و لە بیچمی تیرێکدا هاویشتی، من پێم وایە 'عەزیز گەردی'ش جەوهەری گیان و تەمەنی خۆی بە دێرە سەرسووڕهێنەرەکانی ئەو کتێبە بەخشی. دواتر زانیم ئەوەندەی کار لەسەر وەرگێڕانی ئەو کتێبە کردووە، ئەوەندەی نووسیوە و نووسیوەتەوە، پەنجەکانی خوێنیان لێ چۆڕاوە.

دوو ساڵ دواتر کاتێک پەڕیوەی گەرمێنێ بووم و لە هەولێر گیرسامەوە، لە نزیکەوە چاوم بە زۆر شاعیر و نووسەری بەناوبانگ کەوت، بەڵام چاوە چاو دەمڕوانی خوڵقێنەری داغستانی من ببینم، بەڵام لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەک سۆراغی نەبوو. گوتیان 'عەزیز گەردی'یە ئیتر، نە لەگەڵ هیچ جێگایەک وتووێژ دەکا، نە هیچی لەبارەی ژیانیەوە نووسراوە، تەنانەت حەز ناکا وێنەشی بڵاو بێتەوە.

ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێم ڕەمەزانی



ئەحمەد میرزا لە دەوری قەڵا بە پێش پاساژی کتێبفرۆشییەکاندا دەسووڕاینەوە. رەمەزان سڵاوی لە پیاوێکی بە تەمەن کرد. کاتێ لێمان تێپەڕی، گوتی: مامۆستا عەزیز گەردی بوو.
ئاوڕم دایەوە و لە پشتەوەڕا تێم ڕوانی. پیاوێکی سادە، کز و تاڕادەیەک بچووک، زۆر بە هێواشی دەڕۆیشت و لێمان دوور دەبووە تا لە سووڕانەوەی دەوری قەڵادا لە چاو بزر بوو.
خوایە، ئەوە خۆی بوو، پیاوە ئەفسانەییەکەی داغستانی من؟
کەریم سۆفی دەیگوت من لەوڕا فێری سادەپۆشی بووم. دەیانگێڕاوە جارێک لە ڕۆژنامەی خەبات لە برادەرانی پاشکۆی ئەدەب و هونەری پرسیوە ئێوە بۆ بابەتێک کە لە ڕۆژنامەدا چاپ دەبێ چەند وەردەگرن؟
- پازدە، بیست دینار.
عەزیز گەردی گوتبووی: بۆ یەک وشە نەدەبوو بە هەزاران دیناریش ڕازی بن.
کەچی بۆخۆی تاکە دینارێکی بۆ چاپی کتێبەکانی وەرنەدەگرت.
هاوکارێکم لە گۆڤاری ڕامان بۆی گێڕامەوە:
مامۆستا عەزیز کتێبێکی وەرگێڕابوو و قەرار بوو دەزگای ئاراس بۆی چاپ بکات. منیش ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان دەزگا و مامۆستا بووم و ڕۆژێک کە چوومە سەردانی، گوتی فڵانی من خەرجێکی زۆرم لەو کتێبە کردووە، لە بازاڕ بۆیان تایپ و دیزاین کردووم، داخوا ئەو خەرجەم نادەنەوە؟
کە ئەوەم لای بەرپرسی دەزگا باس کرد زۆری پێ خۆش بوو و بۆ سبەی زەرفێکی دامێ و منیش بە خۆشحاڵییەوە بۆ مامۆستام برد. مامۆستا زەرفەکەی کردەوە و گوتی دە باشە بابم. بەڵام کە پارەی نێو زەرفەکەی دەرهێنا و دەستی کردە ژماردنی وەرەقەکان (هەر وەرقێک سەد دۆلارە و زەرفەکە 80 وەرەقەی تێدا بوو)، چاوی زەق بوون و گوتی ئەوە چییە؟ گوتم ئەوە هەم خەرجییەکانی خۆتە و هەم دیارییەکی بچووکی دەزگایە بۆ تەمەنێک ماندووبوونی جەنابت.
مامۆستا هەر گرتی و زەرف و پارەکانی بە چڕوچاوی دادام و گوتی هەستە وەدەر کەوە! دەتانەوێ بمکڕن؟ کەس نەما؟ دەتانەوێ منیش بکڕن؟
هاوینی ٢٠٠٥ کە وەرگێڕدراوی کتێبی "ڕۆژێک لە تەمەنی ئیڤان دنیسۆڤیچ"م بڵاو کردەوە، غیرەتم وەبەر خۆم نا و بە هاوڕێم "د. ڕەحیم سورخی"دا - دانەیەکم لەو ڕۆمانە بۆ مامۆستا نارد. هەمووی حەفتەیەک بوو کتێبەکە هاتبووە بازاڕ بەڵام کاتێک سورخی وەڵامی بۆ هێنامەوە سەرم سوڕما. گوتی: "کە کتێبەکەم بۆ مامۆستا برد، خوێندبوویەوە. لەگەڵ ئەوەشدا سوپاسی کردی و گوتی پێم خۆشە چاوم پێی بکەوێ."
عەزیز گەردی کتێبەکەمی خوێندۆتەوە؟ کوێڕا؟ دەیەوێ بمبینێ؟!
هەر لە ڕێگەی کاک ڕەحیمەوە شوێنکاتی دیدارمان دیاری کرد: ڕۆژی هەینی، ماڵی مامۆستا.
ڕۆژی هەینی بە شەڕە مازدایەکەی خۆم چووم "کاک ڕەحیم"م هەڵگرت و سەعات دەی بەیانی گەیشتینە بەردەرگەی ماڵی عەزیز گەردی.
ڕۆژێکیان مەوعیدی لەگەڵ کاربەدەستێکی هەرە باڵا دەبێ و کاربەدەستەکە تا نیوەڕۆ بەدیار کەوچک و چەنگاڵی سەرمێزی ریستورانی هوتێلەوە چاوەڕێ دەکا و پاش هەفتەیەک کە گلەییەکە دەگەیەنێتەوە گوێی، مامۆستا دەڵێ پێی بڵێن تۆزێک نەخۆش بووم چوومە مووسڵ!
لە پشت دەرگا لەبەر خۆمەوە بیرم لەو بەسەرهاتە دەکردەوە، کە دەرگامان لێ کرایەوە.
خۆی بوو. زۆر بەئەدەبەوە وەپێش خۆی داین. پانتۆڵێکی کوردی لە پێ و زۆر خاکی.
ئەوی لەو دانیشتنەدا هەرگیز لە یادم ناچێتەوە چاوە ڕەش و قووڵ و ئێجگار غەمگینەکانی بوو. ئەگەر بۆ هەموو کەس ئەوە ڕاست نەبێ، چاوەکانی ئەو،

ئاوێنەی ڕۆحی بوون، ڕۆحێکی ماندووی ئازارچەشتوو و هاوکات زوڵاڵ.

زۆر زوو باسی "داغستانی من"م هێنا گۆڕێ و پرسیم بۆ چاپی ناکەیەوە؟ وەک باسی شتێکی کەم بایەخ و ماوەبەسەرچووی بۆ بکەی هەر زوو باسەکەی لادا. ئەوەندەی گوت: کتێب یەک جار چاپ کرا بەسە، کتێبی دی زۆرن.

باسی کتێبی "چیرۆکی شیرین بۆ منداڵانی خوێن شیرین"ی کرد، کە کاتی خۆی لە ورمێ ئینتشاراتی سەلاحەدین چاپی کردبوو و نوسخەی کەمی گەیبووە دیوی باشوور. دوایی زانیم کەم کتێب هەیە لە دەست ئەو خوێنەرە لەزەبر و ئەو وەرگێڕە پرکارە دەرچووبێ و نەیخوێندبێتەوە.

زۆری لوتف لەگەڵ نواندم و هانی دام کاری زیاتر بکەم. کتێبی "هونەری شیعر"ی ئەرەستووی کە تازەی وەرگێڕابوو، بێ ئەوەی ئیمزای خۆی لێبدا بە دیاری دامێ. من کە کتێبخانەکەم پڕ بوو لەو کتێبانەی بە ئیمزای نووسەرەکانیان پێشکەشم کرابوون و، بوون و نەبوونیانم لەلا وەک یەک وا بوون، کەچی خەت و ئیمزای عەزیز گەردی بە لامەوە بەنرخ بوو و داوام لێکرد بۆم ئیمزا بکات.

مامۆستا زۆر لە دۆخی سیاسی و بەتایبەت هێی زانکۆکان تووڕە و بێزار بوو. پێی وابوو کۆمەڵێک کۆنەبەعسی وەک مافیا دەستیان بەسەر زانکۆکانی کوردستاندا گرتووە. زۆر لە دەسەڵاتدارانی کورد ناهومێد بوو و دەریبڕی کە ئاواتی ئەوەیە خانەنشین بکرێ و بگەڕێتەوە گوندەکەی خۆی (بەحرکە) و تا کۆتایی تەمەن خەریکی خوێندنەوە و وەرگێران بێ. خەڵکی ئاسایی زۆر پێ لە سیاسی و ڕۆشنبیرەکان ڕاست و ڕێکتر بوو و دڵی بەوان خۆش بوو.

لە گەرمەی قساندا بووین لە دەرگایان دا. مامۆستایەکی زانکۆ بوو، هات و کردیە بازاڕی خۆی. بەو گەرمایە بە قەرا دوو کەس قات و ئێلەگ و بۆینباغی پۆشیبوو. هەر ڕستی و خواردی، قسەی پووچ. زۆربەی کاتەکەی لێ گرتین و کاتێ ڕۆیشت مامۆستا چاوێکی ماناداری لێکردین کە ئەمە نموونەیەکیانە و گوتی تازە ئەوە ئەو شەرەفەشی هەیە کە قەت بەعسی نەبووە.

مامۆستا شەرمەزاری کردین و بۆخۆی چای بۆ هێناین. هەر زوو باسی ئەدەب و زمان و وەرگێرانمان دەست پێکردەوە و نەمزانی بە کوێدا کات لە نیوەڕۆ نزیک بۆوە. مامۆستا بۆ نیوەڕۆ میوانی خوشکی بوو و زۆری تەکلیف کرد کە بۆ فراڤینێک لە ڕستۆران میوانی بین. بەڵێنمان نەدا.

ئەو ژوورەی ئێمە لێی دانیشتبووین ژووری میوانان بوو. زۆر حەزم لێبوو بە ژوورەکانی دیکەیدا بگەڕێم کە دەیانگوت پڕی کتێبن. بەڵام تازە درەنگ ببوو.

ساڵی ٢٠١٦ کە بە سەردان چوومەوە کوردستان لە ماڵی هاوڕێم سالار عەبدولڕەحمان بە دیداری مامۆستا شاد بوومەوە. بە داخەوە دۆخی دەروونی زۆر خراپتر ببوو و لە دار و بەرد بە گومان بوو و وەهمی دوژمن مێشک و دەروونی وەها تەنیبوو بڕوای بە کەس نەمابوو.

چەندە دژوازییەکی ناخۆشە، ئەو داهێنەرانەی لەحزەکانی ئێمە دەکەن بە هەنگوین، خۆیان لەوپەڕی تاڵیدا دەژین. هێمنەکانمان، مەلەکشاکانمان، گەردییەکانمان...

بەو حاڵەشەوە دەبێ شوکرانەبژێری "دابەشکەری زمانان بین و سوپاسی بکەین کە شاخەکانمان، گوندەکانمان، دڵەکانمانی لە بیر نەکرد"(*) و عەزیز گەردی'یەکی پێ بەخشین.

(*) ئاماژەیە بە چەند دێڕێکی داغستانی من، بەرگی دووهەم.



مەنسوور یاقووتی

# ڕیشۆڵە

وەرگێڕانی لە فارسییەوە:
عەزیز گەردی



١

پشتی چەماندەوە و لە کونی بچووکی بورجە بەرزەکەوە چاوی بڕییە دەرەوە و گوێی دایە گۆرانیی سەیروسەمەرەی ئەو پیرەمێردە نەناسەی بە تەنیشت کۆنەقەڵەدا ڕەت بوو و گۆرانیی دێرینی (باڵندەی بەیانی) دەچڕی. پیرەمێرد، وەکو هەمیشە دەنگی شەکەت و غەمگین و تێکەڵ بە پەشێوییەکی ناسک و لەرزۆک بوو، بەڵام هەر بەم جۆرەش شێلگیر و چەسپاو بوو.

حیسابی کردبوو، پیرەمێرد ساڵی یەک جار بە تەنیشتی قەڵادا تێدەپەڕێ. چاوی دەبڕێتە بورج و قوللەی بەرز و دیواری کۆن و ترسناک و بەبێ ترس و شڵەژان، گۆرانیی دێرینی (باڵندەی بەیانی) دەگوت و بەوێدا تێدەپەڕی. پیرەمێرد ڕیشێکی درێژ و سەراپا سپی هەبوو. بەژنی دوو مەتر زیاتر بوو. کوڵمەی سوور بوون و کڵاوێکی کەوڵە سمۆرەی لە سەر بوو، کتێبێکی بەرگ چەرم و کۆنی لەبن هەنگڵ بوو و هەمیشە چەند پەپوولەیەکی گەورە و سپی خاڵ سوور بەسەر کڵاوی، یان شانی، یان بە دەوری دەموچاویدا دەسووڕانەوە.

کە ئەو بە تەنیشت قەڵادا تێدەپەڕی، بۆ ماوەی چەند لەحزەیەک، شەپۆلی عەترە گوڵە مورتکی تێکەڵ بە بۆنی برنجی ئێرانی، ژووری ڕیشۆڵەی پڕ دەکرد. ڕیشۆڵە بەژنی قیت دەکردەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا و لەناو حەوشەی بچووک و داخراوی بورجەکە پیاسەی دەکرد، کە بە بەرد و قسڵ لەسەر ترۆپکی قەڵای کۆن دروست کرابوو و دەرگایەکی داری کۆن و مکوومی تێ گیرابوو. تەنیا کاتی جەم، دەکرایەوە و دادەخرایەوە. لە زەین و خەیاڵی خۆیدا، لە ڕێگەی جاران، کە بۆنێکی نامۆ و سەتر و کاڵی دەوری منداڵیی خۆی لێ دەهات، هاتوچۆی دەکرد.

سەگێکی گەنجی چاو بۆری شاد و کلک قیت، لەدوو پیرەمێرد دەڕۆیشت و ملۆمۆی لە شوونی دەکرد. هەموو ساڵێ، ئەو سەگە شادە بە عەوە عەوی پڕزایەڵەی گەنجی و زایەڵەی شادی و بە دڵخۆشی و بە ئومێدێکی ئاڵۆزەوە، بە دوای پیرەمێرددا هەڵبەزودابەزی بوو. ئەوسا کە پیری ڕێبواری ڕێگەی بەفراوی، ئەو گۆرانییە دێرینەی دەگوت، ئەم لەسەر بەفر درێژ دەبوو و پەنجەکانی درێژ دەکرد و لمووزی دەخستە سەر پەنجەکانی و لەناو کپییەکی قووڵی پرمانادا دەچووە خوارێ.

ئەم جارەیان، کە پیرەمێردەکە هات، سەگەکەی دیار نەبوو، ڕیشۆڵە هەر دەتگوت شتێکی بەنرخی لەدەست داوە. پەرێشان و تاساو! چاوی تیژی بە پانتایی بەفراویدا گێڕا، بەڵام هیچ دەوسی سەگەکەی نەبینی. پیرەمێرد بە دەنگی، کە دەتگوت لە قووڵایی مێژووەوە دێ، بە غەمباری و دڵتەنگی و زۆر بە سۆزەوە گۆرانیی دێرینی (باڵندەی بەیانی) چڕی و دوای وەستانێکی زۆر و چاوبڕینە بورج و قوللەکانی قەڵای کپ و کۆن، بە تفتوتاڵی بە سووتانێکی پڕڕق و ئازارەوە، بەندێکی لە گۆرانیی (خانمی دڵبەر) گوت و بە چاوی بەگریانەوە لە بازنەی داخراوی بیگای ڕیشۆڵە دوور کەوتەوە.

پەپوولە بە دوویدا کشان. پەپوولەیەکی سپیی گەورە، دوو خاڵی سووری گەورەی لەسەر باڵەکان بوو. خولێکی لە هەوادا خواردەوە.

نا، حەپەی سەگەکە نەدەهات. چاوی بڕییە پانتایی هەراوی بەفراوی و ئاسۆی خۆڵەمێشی دوور، سەگەکە هیچ شوونی دیار نەبوو. لەناو ئەو بورجەی تێدا حەپس بوو، دەستی بە پیاسە کرد. سەری بردە ناو کونێکی بچووک کە لە ئەنجامی ڕەوتی ڕۆژگار، لە دیواری بورجی بڵند پەیدا ببوو و ناولەپی دەستی بە دیواری ساردەوە نا و چاوی بڕییە حەوشەی بەفراوی قەڵا. لە شوونی جزمەی پاسەوان بەولاوە هیچ شتێ دیار نەبوو. سەرنجی لە حەوشە لابرد و چاوی بڕییە قۆنگرەکانی قەڵا، چەند داڵێکیان بەسەرەوە بوو، سەریان بردبووە ناو بەرچێڵە و وەکو هەمیشە چاویان بڕیبووە قووڵایی نادیاریی.

ئەو داڵانە ببوونە بەشێکی نەپچڕاوی ئەو قۆنگرە بەرد و بەفراوییانە.

چاوی بڕییە ئاسۆ. ئاسۆیەکی خۆڵەمێشی و دەشتێ، کە تا مەودایەکی تەماوی



دوور پڕ بەفری وشک و ئەستوور ببوو.

***

وەک ئەوەی جانەوەرێکی تۆقێنەر کەڵبەی لە خنخنۆک گیر کردبێ و ڕایبگوشێ، ئاوا بە هەراسانی لە خەو ڕاپەڕی، پەنجەکانی بە گەرووی خۆیدا هێنا. دەنگی حەپەحەپی تووڕەی سەگێک دەهات. وایزانی خەون دەبینێ. پێڵووەکانی بە قورسی کەوتنە سەریەک. حەپەحەپی سەگەکە تا دەهات توندتر دەبوو. نێوچەوانی لۆچی تێکەوت، پێڵووەکانی لەسەر ئاوێنەی تۆزاوی لا کەوتن. هەستا و لە کلاوڕۆژنەی بورجەکەوە چاوی بڕییە دەرەوە: ئەو سەگەی شوێن پیرەمێرد دەکەوت، لەناو حەوشەی بەفراوی قوللەدا، قەڵێتێکی ئاسنی لە مل کرابوو و بە زنجیر لە مێخی تەویلە بەسرابووەوە. پاسەوانەکە پارچەقوماشێکی بەسەر دەموچاوی خۆیدا هەڵکێشابوو، تەنیا چاوە تۆقێنەرەکانی دیار بوون. بە تۆبز کەوتبووە گیانی سەگەکە و ئێسکی دەکوتا. تۆبزەکە لە هەوادا دەسوورا و دەهاتە خوارێ و بە پەراسووی سەگەکە دەکەوت. سەگەکە ددانی گڕ دەکردەوە، خۆی بۆ پاسەوانەکە هەڵدەدا و ڕقێکی ئاگرینی لە چاواندا دەجۆشا. تۆبزەکە دەسوورا و دەهاتە خوارێ: بە شان و مل و چڕنۆکی دەکەوت.

ڕیشۆڵە بە مست وەرگەڕایە دیواری بورجەکە. دەتگوت ڕۆژی یەکەمە فڕێ دراوەتە ناو ئەم بورجە. پەلاماری دیواری دەدا و پێلەقەی لە بەردی گەورە و خۆڵەمێشی دەدا. وەکو ئاگر کڵپەی دەسەند و دیواری بەردینی ساردی لە گڕینی سووتێنەری خۆیدا لرف دەکرد. بەڵام دیوارەکە، کە لە کونکردن نەدەهات، بەو ڕەنگە سارد و غەمناکەوە، کە بۆنی جەنازە و بۆنی ڕارەوی کۆنی شێداری لێ دەهات، هەر زوو

هەوڵ و تەقەللای لەبار برد و ورەی ڕووخاند. سەگەکە ئێستا لە ڕق و جۆشوخرۆش کەوتبوو. بە چاوی پڕترسەوە خۆی لەبەر زەبری تۆبز لا دەدا و ناوبەناو قرووسکەیەکی بە ژان و ئازاری لێوە دەهات. تۆبزەکە هەر لە هەوادا دەسووڕا و بەسەر گیانی سەگەکەدا دەهاتە خوارێ: بە دەموچاو و سەر و شان و چەپۆک و لمووزی دەکەوت. سەگەکە، ئەو ئارەقەی لە لەشی دەچۆڕایەوە و ئەو دڵۆپە خوێنانەی لە لووت و زاری فیچقەی دەکرد، بەفری دەکردە پۆقڕ و بە ڕەنگی سوور دەینەخشاند. ڕیشۆڵە چووە ژێرێ، هەستی بە شەکەتی تێماوی کرد. لەنن دیوار دانیشت و دەستی لە ئەژنۆی وەرهێنا و چاوی بڕییە دیواری ساردی لەکوننەهاتوو.

***

گورگە ڕەش شۆڕ دەبووەوە پشت تەپۆلکەی خۆڵەمێشی و گورگی بۆر بە ئاسۆی هەوراویدا هەڵدەکشا. کە بە سەری پەنجە لە دەرگایان دا، ڕیشۆڵە ئاوڕی دایەوە. دانیشت و ڕووی کردە دیوار. دەرگای پشتەوەی نیمچە کرایەوە. کەرتەنانێکی وشک و هەندێ پەنیری بۆگەنیان فڕێ دایە سەر لبادی ناو ژووری بورجەکە. دەرگا قوفڵ درایەوە. ڕیشۆڵە لەقەیەکی لە پەنیرەکە دا و تێی هەڵدایە لایەک. چەمایەوە و لە کونی دیوارەکەوە چاوی بڕییە دەرەوە.

سەگەکە کلکی بردبووەوە ناو گەلانی. پارچەئێسکێکی فڕێ درابووە پێش، تێی ڕادەما و دەلەرزی. سەگەکە، دەیگوت بۆنی شتێکی کردووە. نووسکەیەکی کز و بە ژانی لە گەروو هاتە دەرێ. بێ ئەوەی هەستێتەوە، بەفری بە چڕنۆکەکانی هەڵکەند، کلکی لەقاند و ددانی لە ترسان پێک کەوت. پێستەی وا دەلەرزی، دەتگوت سەرمای زەمهەریری کەوتۆتە گیانی. جووتە چەکمەیەک و تۆبزێک دەرکەوت. سەگەکە مراندی و کلکی لە بەفر کوتا و فرمێسک لە چاوانی سەری کرد. ڕیشۆڵە داهاتەوە سەرچۆک، چاوی بڕییە دەرگای قوفڵدراو و چووە ژێرێ.

٢

ـاڵەکان لەسەر قوولەی بورج سەریان نابووە بنگوێی یەکتر و دەنووکیان دەجووڵایەوە و دەنگێکی سەیریان ـە گەروو دەهاتە دەرێ. ئاسۆ هێشتا هەر خۆڵەمێشی ـبوو. ڕۆژگار ئەوەندە تێپەڕی بوو، ڕیشۆڵە زانی کاتی ـەوە هاتووە پیرەمێرد بێت و گۆرانیی (باڵندەی بەیانی) ـ بەندێکی سروودی دڵکێشی (خانمی دڵبەر) بچڕێ و بورج پڕ بێ لە عەتری مورتک و بۆنی خۆشی برنجی ـێرانی، بەڵام پیری دەشتی بەفراوی هیچ دەوسی دیار ـەبوو. ڕیشۆڵە بە درێژایی ساتەوەختی خۆڵەمێشیی کاڵ، بە شڵەژاوی و چاوەڕوانی لەناو بورجەکەدا پیاسەی کرد. بەڵام هەر دەتگوت پیرەمێرد بە خۆو بە گۆرانییەوە، لەناو جەرگەی ڕۆژگاری خۆڵەمێشیدا کەوتۆتە جاویدانییەکی نهێنی. وەرزی خۆڵەمێشی بەسەر بورجەکەدا تێدەپەڕی و داڵەکان بە شادمانی سەریان دەلەقاند.

٣

لەگەڵ چریکەی گۆرانی باڵندەیەک، هەستا و چاوی خستە سەر کڵاوڕۆژنەی بورجەکە. داڵەکان بە گێژی و حەپەساوی بەسەر قەڵادا دەخولانەوە و ڕیشۆڵەیەکی گەنج بە پەڕی بریقەدار و خاڵی سپیی سەر سینەی، دەنووکی کردبووە و بە شادی گۆرانی دەچڕی. هەوری خۆڵەمێشی شەپۆل شەپۆل لە ئاسۆوە ڕای دەکرد. پاسەوانەکە خەریک بوو بە خێرایی و بە هەراسانی قەیتانی چەکمەی توند دەکرد و دەستی دەلەرزی و لە ترسان چەرق و هۆڕی ددانی بوو.

ڕیشۆڵەکە دەیخوێند، ڕقێکی لەناو دەنگدا بوو، وەکو پشکوتنی گوڵێکی ڕەش وابوو لەناو تەبارە گەنمێکی زەرد کە مەرجانی گوڵاڵەی کێوی بەناو وەرکرابێ.

٧٠/٦/٢٦

کرماشاه

**سەرچاوە:** تووشای باڵندەی سەیروسەمەرەی زاگرۆس، مەنسوور یاقووتی، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، چاپخانەی ماردین، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١١.


کاتێك بیر لە
عەزیز گەردی
دەکەینەوە بیر لە
کێ دەکەینەوە
شاڵاو حەبیبە

**یەك**

کاتێک بەنێو کتێبفرۆشی و ڕەفەی کتێبەکاندا دەخولاینەوە، ساڵانە یەک جار لە پێشانگەی نێودەوڵەتیی کتێب لە هەولێر، بەشدار سامیی هاوڕێم دەیگوت، ئەوەتیهێ؛ بە چەنەی ئاماژەی بۆ شوێنێک لەو ناوە دەکرد، کە دەکرا لەو دیمەنەدا هەر شتێک سەرنجی مرۆڤی ڕاکێشابا، بەڵام بەبێ دوودڵی ئەگەر عەزیز گەردیی تێدا بوا، پێویستی بە پرسین نەبوو کە دەشێت مەبەستی سامی کێ یان چی بێت. زۆر بە خێرایی چاو هەتەری لێ دەکرد و دەیتوانی ئەو پیاوە بناسێتەوە، کە خۆی لە عالەم و ئادەم دەدزییەوە.

بە جووتێک پێڵاوی عەنتیکە و تاکشەڕواڵێکی بۆرکەڵەوە، کووپێکی سەفەری لە دەستی و بزەیەکیش لەنێو ڕووخساری، لە بەر پێیەکانیشی عەلاگەیەک کتێب و ئۆقرەگرتوو لەسەر یەکێک لەو کورسییە باغانەی لە کافێکە دانرابوون، وا دیار بوو هەر کەسێک بە لایدا تێپەڕیبا و تەماشای کردبا لەو بزەیە بێبەشی نەدەکرد، کە دەکرا هاوکات مانای ئەوە بێت دووربەدوور هەمووتان دەناسم یان چونکە هیچتان ناناسم بە یەک بزە تەماشاتان دەکەم، یان تەنیا نیشانە بوو بۆ دەروونە هاوڕێیانەکەی و- هەرچەند پێچەوانەی ئەوەیش ناسرابوو- یانیش تەنیا لەبەر شەرمنییەکەی بوو، هەڵبەت ئەگەر کەسێکی وا بووبێت، بەهەرحاڵ لەو چەندجارەی ڕێکەوتیمان کرد دیمەنەکە چەند چرکەیەک زیاتری نەدەبرد، پاشان دەکەوتینەوە ناو باسی کتێب و پێشانگە و ئەوەی کە ئێوارە لە کوێ چی بخۆین و ئەوەیش کاتێکی چاکی دەبرد.

بەڵام عەزیز گەردی لە بەشێکی زەینماندا هەر دەمایەوە و کاتێکیش مرد، سامی گوتی باشە بۆ نەچووین بۆ لای قسەیەکی لەگەڵ بکەین یان وێنەیەکی لەگەڵدا بگرین. بەڵام ڕەنگە ئەو چەند چرکەیەی گێڕامەوە جوانییەکەی هەر لەوەدا بووبێت کە بەو جۆرە ڕووی دا، یان ڕووی دەدا. ئێمە دوو-سێ جار لە کاتی جیاجیادا بینیمان و تاقەشتێک ڕووی دابێت ئەوەتێهەکەی سامی بوو، ئەمەیش هەموو چیرۆکەکەی ئێمە بوو لەگەڵ وەرگێڕێکدا کە خۆشمان دەویست.

سامی لەم بەشەدا زیاتر خۆی دەسەپێنێت، کە زۆرجار دووربەدوور بە تەلەفۆن قسەمان کردووە و کاتێک لە هەزار باسمان داوە، لە پڕ گوتوویەتی خزمێکی هەیە خزمی نزیکی عەزیز گەردییە و دەڕێت کوڕە زۆر جار گازی دەکەین دانی نیوەڕوان بێتە کنمان شیوی بخوات. کەواتە ئەمەیش بە مێشکی من زیاد بوو، کە پیاوە خۆدوورگرەکە جاروبار واز لە قەڵەم و کاغەزەکەی دەهێنێت و کووخەکەی بەجێ دەهێڵێت و ڕوو دەکاتە یەکێک لە ماڵەکانی بەحرکە و کەوچکبەدەست خەریکی شیوخواردن دەبێت. ئنجا سامی پرۆژەکەی گەورەتر دەکرد و دەیگوت بە خزمەکەمانم گوتووە مۆعیدێکم بۆ وەربگرێت و بەشکوو بیبینم، عادەتەن خزمەکەی سامی دەیگوت وەی بەسەر چاو و جا چی لەوە ئاسانتر، بەڵام وەی بەسەر چاو و چی لەوە ئاسانترێک کە هەر ئەمرۆوسبەی پێ دەکەوت.

دەشێت بۆ کەسێک کە خوێنەری کتێبەکانی عەزیز گەردی بێت، خۆشی ئەوە بێت جارێک ئەوی بینیوە لەناو ژاوەژاوی پێشانگەی کتێبەکە لەسەر کورسییەک لە کافێیەکی هەتا بڵێیت ناخۆش دانیشتووە و بە پەرداخی سەفەری چای خواردووەتەوە، نەک ئەوەی کوردینووسێکی خراپ بێت و بڵێیت عەزیز گەردی فێری کوردینووسینی کردم، یان حزبی بێت و بڵێیت مامۆستا پێی گوتووم تۆ قەت حزبی نەبوویت، یان نووسەرێکی خراپ بێت و بڵێیت مامۆستا دەیگوت لە نووسەرانی کورددا بەس نووسینی تۆ بە کەڵک دێت، یان وەشانخانەت هەبێت و دەستیدەستێت بە کتێبەکانی کردبێت و دوای مەرگی بڵێیت مامۆستا دەیگوت بەس تۆ ڕێزی کتێب دەگرێت. عادەتەن ئینسان ئەگەر بڕیاری دا بێدەنگ بێت، زیاتر لەوانەی شەوانەڕۆژ قەوچەقەوچ دەکەن قسەی بە ناوەوە دەکرێت. دیارە مەبەستم ئەوەیە دوای مەرگی عەزیز گەردی، کە دەهاتیتە فەیسبووک پۆست و گوتارت



دەخوێندەوە، تەماشات دەکرد ئەو پیاوەی هەمیشە بێدەنگ و دوور بووە، بە دەیان چیرۆک و قسەوباس و نەقڵونەزیلەی لێ دەگێڕدرێتەوە، کە تازە کەسیش ناتوانێت پێچەوانەکەیان بسەلمێنێت و کابرا خۆیشی نەماوە بڵێ وایە یان نا و ئەگەریش مابوا خۆ هەر متەقی لێوە نەدەهات. مەرگی ئینسان ئەوانی تر دەمکراوە دەکات لەوەی بە هەوەسی خۆیان قسەی لە دوو بخەن و چیرۆکی لەسەر دروست بکەن و چیرۆکەکانیش هەمیشە لە بەرژەوەندیی چیرۆکدرووستکەری زیندوودا بن.

ڕەنگ بێت بۆ من و سامی ئەوە باشتر بووبێت، کە نەچووین قسەی لەگەڵدا بکەین و مۆعیدوەرگرتنی خزمەکەی سامییش بێسەرەنجام مایەوە، چونکە دوور نەبوو مامۆستا پێچەوانەی مەیلی سادەی ئێمە جووڵاباوە و ئەوکات ئێمەیش وەکوو خەڵکی ناچار باین چیرۆکێکی سەمەرە لە مەڕ دیدارە ئەفسانەییەکەمانەوە دروست بکەین.

مەرگی عەزیز گەردی ئەوەی نیشان داین، لەو وڵاتەدا کە هەموان بە چەند زمان و دەموزار بە خەیاڵی ئەدەبەوە لە هەزار باسوخواسی نائەدەبی دەدەن، ئیتر گرنگ نییە تۆ ئەو کەسەی لە سووچێک پەنات گرتووە و بێدەنگ خەریکی وەرگێڕانیت، بەڵکوو بە ناوی تۆ و لەسەر ناوی تۆیش قسە دەکرێت و چیرۆکی پشتڕاستنەکراوە هەڵدەبەسرێت.

ئەو سیاسییانەی هەرگیز بۆیان نەبوو تەنانەت لە قاپیی ماڵەکەیشی نزیک ببنەوە بسکەی سمێڵیان دەهات- هەرچەند هەندێکیان سمێڵیان هەر نەبوو، کە دەرووی خێریان لێ کرابووەوە و بە دیار جەستەی لاواز یان تابووتەکەیەوە وەستابوون، تەنانەت هەبوو هیوای بەهەشتی بۆ دوکتۆر خواستبوو، بێئاگا لەوەی هەر ئەو دوکتۆرە لە داخی ئەو بەزم و تێکەوڵێکە هەرزانانە حەزی دەکرد لە دۆزەخەکەی دانتێدا بژی، نەک لە بەهەشتەکەی ئەوان.

## دوو

عەزیز گەردی ئەم هەموو وزەیەی بۆ وەرگێڕان لە کوێوە دەهێنا؟ لە ڕاستیدا ئەو مرۆڤێکی بایۆلۆژیی ئاسایی بوو بە وزەیەکی سروشتییەوە، بەڵام لەوەدا زیرەک بوو کە خۆی لە وزەی پیس و خراپ دوور دەگرت. ئەو بە دوورکەوتنەوەی لە ناوەندی ئەدەبی و نووسەران، کۆی ئەو باسە تووڕەهات و نزم و بێکەڵکانەی لە دنیای خۆی تەکاند، کە زۆر ئاسان دەیانتوانی ببنە هۆی ساردکردنەوە و بێهیواکردنی. ئەو کاتەی دەکرا بیدا بەوانی تر و بە مشتومڕی بێسوود بەسەری ببات، بە کەسانی ئەدەب-و-کاتناسی وەک فالاچی، دانتی، تولستۆی، هەمزەتۆف و دەرویشیانی... بەخشی.

لە ژیانی ئەدەبیی هەر نووسەرێکدا، یەک جار کە ڕووی دا و لە هەوای نووسین دوور کەوتیتەوە و هەستت ئەو چێژە دەگمەنەی بەر دا، ئیتر ئەستەمە ئەو ڕکێفە بە دەستەوە بگریتەوە، کە ساڵانێک مسۆگەر ڕاتدەوەشاند. هەمنگوەی ساڵانی ساڵ پێشتر لە هەمان هەستی عەزیز گەردیی ئێمەدا دەژیا. ئەو لە ژیانیدا تەنیا چوار چاوپێکەوتنی ئەنجام دا و لەو ژمارەیەدا یەکیانی لێ دەرچێت ڕۆژنامەنووسان بە زۆر خۆیان کردووە بە ماڵەکەیدا. بیانووی هەمنگوەی هەمیشە ئەوە بوو کە خەریکی نووسینە و ئەگەر خۆی بە کاری ترەوە سەرقاڵ بکات و داوەکەی لە دەست بەر ببێت، گرتنەوەی ساڵانی ساڵ دەخایەنێت.

ئەم خۆدوورگرتنەی وەرگێڕەکەی ئێمە تەنانەت دەرفەتی ڕەخنەی هەژارانەی وەک دوو واو و چەند یای لە کتێبەکانی دوور خستەوە و بگرە هەر ڕەخنەیەکی دیکەیش، دەنا مخابن کتێبەکانی بە شێوەیەکی گشتی لە ڕووی ڕێنووسەوە پوختەکراو نین و ئەو زمانە یەکشێوەیەش، کە بۆ زۆربەی کتێبەکانی بەکاری هێناوە، مایەی ڕەخنەیە، کە چۆن

دەکرێت ئەدەبیاتی کۆن و هی نوێ، گوتار و مێژوو و شیعر و کتێبی نووسەرانی خاوەنشێوازی جیاواز، گشتی بە یەک چەشنەزمان وەربگێڕین!
بەڵام لە سەرێکی ترەوە تێدەگەین جوان سەرنجی پرسی زمانی داوە، ئەو کتێبەکانی چاپ نەدەکردەوە، چونکە پێی وا بوو زمان بەردەوام لە گۆڕاندایە و ئەگەر قەرار بێت ئەو کارە بکات، ئەوا زمان بایی ئەوە گۆڕاوە کە ناچاری بکات وەریان بگێڕێتەوە. ئەوەی نووسەرێک لە بابەت زمانەوە بە بیرکردنەوەیەکی وا رند و زیندوو گەیشتبێت و بەڵام لە وەرگێڕاندا جیاوازیی زمانی لە نێوان نووسەران و ئەدەبیات و سەردەمە لێک جیاوازەکانیاندا دروست نەکات، مایەی تێڕامانە. بە ڕێزەوە دەمەوێت بڵێم ئەو کارە لەو پیاوە زیرەکە چاوەڕێ ناکرێت.
هەڵبەت بەدەر لەو باسانە، ئەو زمانەی عەزیز گەردی پێی دەنووسێت کوردییەکی کوشتوکاڵییانەی لێرەولەوێ ئاوێتە بە هەولێرییات و وەرگێڕانی شکستە و دەربڕینی خۆکردە، کە پێکەوە وا دەکەن زمانەکەی بۆ من سەرنجراکێش و زەیننەواز بێت. مەبەستم لە وەرگێڕانی شکستە ئەوەیە جاری وایە هەست دەکەیت ڕاستەوخۆ وەرگێڕانی وشەبەوشەی بۆ نموونە فارسییەکەیە، کە دەکەویتە بیرکردنەوە و نەختێک لاجانگتی بۆ دەخورێنیت ڕەنگە بە خۆت بڵێیت دەی ئەمەیش دەبێت و خراپیش نییە. ڕەنگە زمانەکەم ڕەنگی ڕەخنەی پێوە بێت بەڵام ڕاستییەکەی خەریکم ستایشی دەکەم. ئەگەر خوێنەر نموونەی گەرەک بێت، دەتوانێت سەیری ژیان و جەنگ و هیچی تری ڤالاچی بکات. ساڵی ٢٠٠٨ لە خانەی وەرگێڕان چاپ بووە. ئەوکات ئەو خانەیە پارەی چاکیان دەدا بە وەرگێڕ-و-نووسەران، بەڵام دەترسم عەزیز گەردی گوتبێتی بەس ئەنگۆ چاپی کەن پارەم پێ ناوێ.

**سێ**

ئەمن نەمکردووەتە خوو لە کاتی قسەکردندا پێ زیاد رابکێشم، بۆیە وا بزانم بە خۆڕایی مۆری تاوان بە تەوێڵی کەسەوە نانێم ئەگەر بێت و بڵێم هەرکەسێ شەرەفی چوونە مەیدانی ئەدەبی دەست نەکەوتبێت، گیاندارێکە هێشتا لە خەوی گرانی پێش هاتنەدنیاوە واگا نەهاتووە و هێشتا لە زگی دایکیدایە و بە ڕووناکی شاد نەبووە، نە چاوی دەبینێ، نە گوێچکەی دەبیسێ، نە هیچ هەستێکی تری تەواو کار دەکات، تەنیا ئەوەندە هەیە خواردنەکە دەخوا و دەخەوێ و هەڵدەستێتەوە و دەجووڵێتەوە... ئەوانەی لە دەوری ڕاستەقینەی ئەدەب گەیشتوون زۆر پێی قەرس دەبن کە چاویان بەم هەزاران کەسە دەکەوێ لەسەر زەوی دێن و دەڕۆن و خۆیان بە زیندوو تێ دەگەن، کەچی ڕاستییەکەی وا نییە، ژیانیان لە ژیانی ورچێکی زستانی بەخێروبێرتر نییە.
عەزیز گەردی، ساڵی ١٩٧٦ لە بەغداد، سەردەمانێک کە هێشتا بیستوچەندێک ساڵی بوو، ئەم کتێبەی ئارنۆڵد بێنێت، کە چەند دێڕێکمان لێی خوێندەوە، سەرنجی ڕادەکێشێت و دەیکاتە بیانوویەک کە خەڵکی پێ هان بدات بۆ کتێبکڕین و خوێندنەوە و ڕووکردنە دنیای ئەدەبیات. "چەشەی ئەدەبی" کتێبێکی سادە، بەڵام تەواو بنەڕەتییە، تەنانەت فێرت دەکات چۆن کتێب بکڕیت و چەندێک لە پارەوپوولەکەتی بۆ تەرخان بکەیت. وای دەبینم هەر ئەمە بووەتە بنەڕەتێک بۆی هەوڵ بدات بە وەرگێڕان کتێبخانەیەک بۆ ئەو خوێنەرە گریمانەییە دروست بکات. کاتێک خوێنەر هان دەدەیت بۆ کتێبکڕین و خوێندنەوە و کتێبخانەدروستکردن، دەبێت مشوورێک لەوەیش بخۆیت ئەگەر سەرچاوە کەم بێت. بۆیە هەندێک کەس قسەی گەورە گەورە دەکەن و خۆیان پێ مەعاوییەی ئەدەبیاتی کوردییە- کابرا بە ورگپەرەست بەناوبانگ بوو- کەچی ئیشی بچووک بچووک بەرهەم دەهێنن، بەڵام عەزیز گەردی خۆی بە عەمەلەی زمانی کوردی دەزانی و بە بێدەنگی ئیشی گەورەی پێشکەش دەکرد.
ئەو کە بە گشتی خۆی لە قسان دوور دەگرت، بە کتێبەکانی دەیگوت بڕوانە



چیم کردووه، نووسەری ئێمە عادەتەن دەڵێت بڕوانە چیم گوتووە.
ئەگەر جارێکی تر سەیری پەرەگرافی کتێبەکەی چەشەی ئەدەبی بکەینەوە، کە لە کتێبەکانی سەرەتای ژیانی ئەدەبیی وەرگێڕدایە، ئەو تامەزرۆیی و ڕاستگۆییە لە عەزیز گەردیدا دەبینین، کە ساڵانی دواتری ژیانی بە هەڵچنینی یەک لەسەر یەکی کتێبەکانی خستییە ڕوو. ئەو بە تەواوەتی بۆ چێژەکانی خۆی کۆشا و هیچ درێغیی نەکرد، ئەوەی لەم بەینەدا ئەدیبە و ناخوێنێتەوە و کابرا گوتەنی موشتاقیشە؛ ورچێکی نوستووە و ئێمە تەنیا پرخەپرخەکەی دەبیستین، هەڵبەت ورچ ئەگەر بپرخێنێت.

**چوار**

عەزیز گەردی لەو دەگمەن نووسەرانەی کورد بوو وا هەست دەکەم ڕازی ئەم دنیایەی بەجێ هێشت. ئەم ڕازیبوونە تەنیا لێشاوی کتێب و خوێنەر پێت نابەخشێت، بەڵکو هەموو ئەو کتێبانەی وەری گێڕاون، کە ڕێژەکەیان ئەوەندە زۆرە ڕەنگە کەمتر کەسێکمان توانیبێتمان هەموویان بخوێنینەوە؛ ئەو دانیشتووە و خۆی بۆیان پەستیوەتە کونجێکی بەحرکە و ژیانی بۆ وشە و ڕستەکاری و زمانیان تەرخان کردووە. هەر ئەمەیش تەنیایی و هاوکات ڕازیبوونی پێکەوە پێ بەخشی. عەزیز گەردی هاوەڵی هەرە نزیکی زمانی کوردی بوو، ئەمەیش لەو جۆرە قسانە نەبوو ئەوانەی سەرەواوێک لە زمان و بەزمەکانی چی چۆن دەنووسرێت و چۆن کوو دەنووسرێت دەیڵێن، ئەو ئەسڵەن ئەو قسەیەی هەر نەکردووە، شەرمی دەکرد شتی وا بڵێت، بەڵکو لەگەڵ هەر کتێبێکیدا سەلماندوویەتی، تەنانەت کەموکوڕیی کتێبەکانی کوردیناسێکی وەک عەزیز گەردی، بۆ ئەوەیە لێوەی فێر ببیت، نەک شاگەشکە ببیت.
بۆیە سڵاو لە بزەی پاکژ و هەوڵی تاقانەت بۆ زمانی کوردی، کە جارێک یان چەند جارێک، بە شایەتیی سامی، یان سامی بە شایەتیی من، تۆمان لە پێشانگەی نێودەوڵەتیی هەولێر، لە کاتێکدا ژاوەژاو لەنێو ئەو جەژنی کتێبەدا مێشکی زەلامی دەبرد، بینی و لەوێشدا دیسان هێدی دانیشتبوویت و ڕامابوویت لەو حەشاماتە و هەرگیزیش نەمدەزانی دوای ئەو چایە تەنیا چوار ساڵی دیکە دەژییت و نەیشمزانی هەرگیز ئایا تۆیش وەکو من چای بەبێ شەکر دەخۆیتەوە، یان عادەتەن وەک پیاوی کۆن، ئەگەر پڕی نەکەیت لە شەکر هەستی پێ ناکەیت.

قسەکردن لەسەر کار و بەرهەمەکانی عەزیز گەردی سادە و سانا نییە. بۆ خوێنەرانی کوردزمان گەردی هاوشێوەی پەیامبەرێک فریادرەسی زمان و ئەدەبیاتی کوردی بووە. ڕوونە زمان کتومت وەک هەر بوونێکی ئەم گەردوونە، لە گوزەر و فەنابووندایە. بەڵام تەنیا نووسین و وەرگێڕان دەتوانن گیان بکەنەوە بە بەری زماندا و لە فەوتان بیپارێزن. لەم بوارەشدا عەزیز گەردی خودان دوو باڵ بووە، هەر بەو دوو باڵە توانیویەتی بەرزەفڕ لە ئاسمانی زمان و ئەدەبیاتی کوردیدا لە شەقەی باڵ بدا. یەکێکیان کارکردن لە بواری ئەفسانە و هەقایەت و ئەدەبیاتی زارەکی گەلاندا، باڵەکەی دی خۆشسەلیقەیی لە هەڵبژاردنی دەق و وەرگێڕاندا:

## باڵی یەکەم:
## ئەدەبیاتی زارەکی

ئەدەبیاتی زارەکی و ئەفسانە و هەقایەتی گەلان بەشێکی فراوان لە وەرگێڕان و کارەکانی عەزیز گەردی پێک دەهێنن، بە نموونە: هەقایەتی کوردەواری/ سێ دەرمان، ئەفسانە و ڕازی کوردی، ئەفسانەی کوردی، ئەفسانەی لادێنشینانی کورد، ئەفسانەی ئەڵمانی، فیرعەونی، ئەستەنبولی، ئێرانی، هیندی، ئەفریقی، سلاڤی، لوری و بەختیاری و شوشتەری، هەنگاری، تورکیایی، ئەرمەنی، ئازاربێجانییە و تەلخوون.

ئەفسانە و هەقایەت و ئەدەبیاتی زارەکی گەلان بە زۆری چیرۆکگەلێکی هاوشێوە و سەر بە فۆلکلۆرن کە تایبەتن بە تاک یان کولتوورێکی دیاریکراوەوە. لەبەر ئەوەی میللەتی کورد، وەک میللەتانی ڕۆژهەڵات، زیاتر میللەتێکی بەوێژ بووە تاوەکو بنووس، ئیدی خاکەکەی پاراوترین خاک بووە بۆ ئەوەی عاشقەزمانێکی وەک عەزیز گەردی، دەست بە کۆکردنەوە و وەرگێڕانی هەقایەت و بەستە و ئەفسانە کوردییانە بکات و دێ بە دێ، جێ بە جێ، هاوشانی پیر و هەقایەتخوانانی کورد ڕێ ببڕێ. فۆلکلۆر و ئەفسانە پایە و بناغەی ئەدەبیاتی هەر گەل و نەتەوەیەکن، ئەرک و دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئەدەبی و ئایینی و دەروونی دەگرنە خۆ. هەر بۆیە کۆکردنەوە و وەرگێڕانی ئەم هەقایەت و ئەفسانانە ڕۆڵێکی گرنگ لە بواری پێناس، نەتەوە و خاک، مانەوەی زمانی کوردی، بەها و تێگەیشتنی ژیان و هەڵدانەوەی مێژووی کورددا دەگێڕن. گرنگترین تایبەتمەندی ئەفسانە کوردییەکان لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

**یەکەم:** گێڕانەوەی ڕووداوەکان لە زاری باڵندە و ئاژەڵانەوە. بە جۆرێک فێڵبازترین، زۆرزانترین، ژیرترین و گچکەترین ئاژەڵەکان ڕۆڵی سەرەکییان تێدا دەگێڕن. یاخود هەر یەکێکیان خاوەن پێگە و ئەرکی خۆیانن، تەرپۆش و جوان خۆیان تەیار دەکەن تا بێنە زمان و باوەڕ بە بینەر و خوێنەر بهێنن کە ئەوان ئاوێنەی ڕەفتار و ئەدگاری مرۆڤەکانن. دیارترین ئەو باڵندە و ئاژەڵانەش کە لە ئەفسانە کوردییەکاندا هەن و هەمیشە وەک سمبوولێک بەکارهاتوون، ئەمانەن: ئەسپ، گورگ، ڕێوی، پشیلە، مار، کۆتر، قەلەڕەش. یاخود ئەم ئاژەڵانە وەکو ئامۆژگارێک دەدوێن و دەبنە مایەی پەند و عیبرەت بۆ مرۆڤ. ئەمەش ڕاستەوخۆ وێنەدانەوەی هەندێک ئیدیۆم و پەندی پێشینانی کوردییە، وەک: ((بەرد لە جێی خۆی سەنگینە، پەتی درۆ کورتە، لە پرێکدا نەبووە بە کوڕێ، مایە سەری قازانجیش دەخوا، بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی دانا هتد...))

**دووەم:** ڕووداو و ئەفسانە کوردییەکان بە دەوری شەڕی مرۆڤە بەهێز و بێهێزەکان، ڕەعیەت و مفتەخۆر و ئاغاکان، نەدار و داراکان، پاشا و شازادە

و ئەسپی سپی، جەنگی چارەنووس و بەدیهاتنی خەون و ئاوات و سەرکەوتنەکاندا دەسووڕێنەوە. زەمەنی ڕووداوەکان ڕابردووە و زۆر جار بەرەو ڕزگاری و سەربەستییەکی نەبڕاوە مل دەنێن. هەر هەقایەتە و خودان پاڵەوانی خۆیەتی، ئاخر پاڵەوانی ئەفسانەکان شەڕی مان و نەمان دەکەن و چارەنووس‌سازانە دەجەنگێن.

واتە بە پێچەوانەی گێڕانەوەی مۆدێرنەوە، کە گێڕانەوەی مۆدێرن زیاتر کارەکتەرسازی تێدا کراوە، تاوەکو پاڵەوانبازی.

**سێیەم:** خاڵی زەقی ئەفسانە و هەقایەتە کوردییەکان، دەرخەری سادەیی و خۆشباوەڕییە لە ڕووی دینییەوە. مشتێ لە خەرواری، لە چیرۆکی "بزنی بزبزۆک" و "جۆلا"دا دەردەکەوێ: هەقایەتی جۆلا باس لە پیاوێکی لادێی دەکات کە نەداری تەنگی پێ هەڵچنیوە، ملی دەشت و چۆڵەوانی دەگرێتە بەر هەتا بەرەبەری نیوەڕۆ دەگاتە گوندێک. کاتێ بەناو گوندەکەدا دەڕوا ژنێک دەبینێ لەتەک خانوویەک وەستاوە، خوری دەڕێسێ.

ژنە، کاتێک چاوی بە کابرای لادێی کەوت گوتی: ((برا ئۆغرت خێر بێ، ئەوە لە کوێ دێی و بۆ کوێ دەچی؟)) کابرای لادێی، کە زۆر دڵتەنگ و ناڕەحەت بوو، لەبەر ڕکی خۆی گوتی: ((لە دۆزەخەوە دێم و دەچمە دۆزەخ!))

ژنە هەڵیدایێ و گوتی: ((مادام لە دۆزەخەوە دێی، توخوا ئاگات لە ئەحمەدی برام نییە؟!))

وەختێ تا کۆتایی هەقایەتەکە دەخوێنینەوە، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە کابرای دەربەدەر بە هۆی خۆشباوەڕی ژنەکەوە دەتوانێ خۆی لە هەژاری قوتار بکات. هەقایەتی "جۆلا"، نیشانە و نموونەی مرۆڤی ساویلکە و خۆشباوەڕی نێو کۆمەڵگەیە، دەرخەری خورافیات و نەبوونی هۆشیارییە. هاوکات ژن لە ئەفسانە کوردییەکاندا هەم وەک کەسانی فێڵباز، ژیر و تێگەیشتوو و دونیادیدە، هەم پەریئاسا و مەکرۆکە و دولبەرانە ڕۆڵ دەگێڕن. واتە دەتوانین بە هەردوو باری دەروونی و دەرەکیدا پێگەی ژن لە ئەفسانەکاندا دیاری بکەین.

**چوارەم:** ئەوەی باوە هەقایەتەکان زیاتر بۆ منداڵان گێڕدراونەتەوە، یان بۆ ترساندن و خەولێکەوتن بووە، یان بۆ خافڵاندن و ژیرکردنەوە. بۆ نموونە، کاتێک منداڵ بە گوێگرتن لە ڕاز و ئەفسانەکان خەو دەیباتەوە، دەڵێن:

ئەی فنجانی پڕ نەبات (مەبەست منداڵەکەیە)،
خەو هاتۆتە لات، سەڵاوات لە جەمالی محەمەد!

**پێنجەم:** لە ئەفسانە و هەقایەتە کوردییەکاندا ئەفسوونئاسا ئێستاتیکا و هونەری گێڕانەوەیەکی باڵا بەکار هێنراوە، ئەمەش یارمەتیی گوێگر و بەردەنگ دەدەن پەی بە سیحری زمانی کوردی و جوانیی ئەدەبیاتی زارەکی کوردی ببەن. خۆی لە خۆیدا ئەم هەقایەت و ئەفسانانە، هەنگوین و شیلەی هەر زمانێکن؛ لێوڕێژن لە وێنەی ئەفسووناوی و دڵکێش. گرنگ نییە گوێگر یان بینەر لە چ تەمەنێکدایە؛ منداڵ، لاو یان پیر، چونکە هەڵقوڵاوی ژینگە و کولتوورەکەن، دەستبەجێ لە ناخودئاگای هەر تاکێکدا جێ خۆش دەکەن. دواجار ڕەهەند و کارکردێکی گرنگی هەقایەت و ئەفسانەکان وێنەدانەوەی دەروونین، بۆیە کاریگەرییان لەسەر تێگەیشتنی زانیارییە نوێیەکان هەیە و دەبنە هۆی ئەوەی ناخودئاگا ئاڕاستەی گێڕانەوەکانمان بگۆڕن.

### باڵی دووەم:
### خۆشسەلیقەی لە وەرگێڕاندا

بەشێکی زۆری ئەو ناونیشان و کتێبانەی کە گەردیی ئەدیب بۆ وەرگێڕان هەڵی بژاردوون، پێویست و بەجێ بوون؛ دەکرێ خۆشسەلیقەیی لە هەڵبژاردنی دەق و وەرگێڕاندا، بە یەکێک لە گرنگترین هۆکارەکانی تاقانەیی عەزیز گەردی



بزانین. بەو زمانپاراوی و ڕەوانبێژییەوە، ڕزگارکەری هەموو ئەو نووسەرانە بووە کە وەریگێڕاون. چونکە وەرگێڕان ئەمانەتپارێزی و شکاندنی زمانە، نەک بەکارهێنانی فەرهەنگۆک. هەروەک ئەو پەندە فەرەنسییەی دەڵێ: ((وەرگێڕان وەک ژن وایە، ئەگەر جوان بێت وەفادار نییە، ئەگەر وەفادار بێت جوان نییە.))

لێرەدا دەمەوێ دوو نموونە لە ئەزموونی کەڵەوەرگێڕی فارس، محەمەدی قازی بهێنمەوە کە بە ڕەگەز کورد بووە. هەروەها محەمەدی قازی ڕۆمانێکی بە ناوی "زارا عەشقی شوان"ەوە هەیە و، ئەم ڕۆمانە لە لایەن عەزیز گەردییەوە کراوە بە کوردی. نیازم نییە هاوسەنگی لەنێوان محەمەدی قازی و عەزیز گەردیدا دروست بکەم، بەڵکو دەمەوێ باڵابەرزی میراتی کوردییش لە وەرگێڕان و زماندا، لەژێر سێبەری گەردیدا بخەمە ڕوو:

یەکەم: محەمەدی قازی ڕۆمانێکی نووسەری پورتوگالی ژۆزوێ دو کاسترۆ بە ناوی "مرۆڤ و قرژاڵەکان"، وەردەگێڕێتە سەر زمانی فارسی، ڕۆمانەکە دەپەرژێتە سەر هەژاری، برسییەتی، بەدبەختی و دەرد و ڕەنجی چینی زەحمەتکێشی بەرازیل. ڕۆژگار دێت و دەڕوا هەتا ڕۆژێ محەمەدی قازی بە خزمەتی ئەم نووسەرە دەگات، ژۆزوێ دو کاسترۆ پرسیاری ئەوەی لێ دەکات، ئایا هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم کتێبە و وەرگێڕانی بۆچی دەگەڕێتەوە؟ محەمەدی قازی لە وەڵامدا دەڵێ: ((ئێمە لێرە ناتوانین ڕاستەوخۆ باسی بەدبەختی و نادادی لەرادەبەدەری وڵاتەکەمان بکەین، چونکە تووشی ساواک و ئازار و ئەشکەنجە و زیندان دەبین. بەڵام ئەگەر نووسەرێک — هەر بۆ نموونە ئێوە — دەرد و بەدبەختییەکانی خەڵکانی چەوساوەی وڵاتەکەی لە کتێبێکدا خستبێتە ڕوو، ئێمە هەست بکەین ئەوەی بەسەر خەڵکی وڵاتەکەی ئێمەدا دێت، کتومت یان تا ڕادەیەک هاوشێوەی ئەوەیە کە لەو کتێبەدا باس کراوە، قۆڵی وەرگێڕانی لێ هەڵدەماڵین، تاوەکو سووکنایییەک بە دڵمان بدەین. جا ئەگەر بووینە جێگەی ڕەخنە و چاودێریی دەزگای سانسۆر، دەڵێین ئەمانە سەر بە فلانە وڵاتن و پێوەندی بە وڵاتی ئێمەوە نییە... بە واتایەکی تر، ئێمە لە پەنای ناوی ئێوەدا قسەی خۆمان دەکەین، لە پەنای ناوی ئێوەشدا لە چاودێری و ئازار پارێزراوین.)) کەواتە جێی خۆیەتی بەرهەمەکانی عەزیز گەردییش بە زمانحاڵی گەلی کورد بزانین. لەگەڵ ئەوەشدا گەلی نووسەری بێگانە لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسیویانە، ئێمە تەنیا لە ڕێی ورت و وریایی عەزیز گەردییەوە، دەتوانین هەم بە بەرهەم و نووسەرەکان ئاشنا بین، هەم لە هەڵوێست و تێڕوانینیان لە بارەی کوردەوە تێبگەین. بە نموونە کتێبەکانی: ئیلیزابێث لایارد، لووسی گارنێت، لیژەک ژیگیل، میشێل لیزنبێرگ، جۆیس بلۆ، م. ب. ڕودێنکۆ، هتد...

دووەم: محەمەدی قازی دەڵێ: ((هۆکاری سەرکەوتنی من لە وەرگێڕانی شاکاری "دۆنکیشۆت"دا، دۆزینەوەی زمانی سەردەمەکە بوو، واتە هاوزمانی سەردەمەکەم دۆزییەوە، کە زمانی فارسی بوو لە سەردەمی سەفەوییەکاندا.))

لە کۆتاییدا جێی دڵخۆشییە بەوەی ئێمەیش دەتوانین لە ڕێی کۆمیدیای دانتی، داغستانی من و ئەفسانە و دەیان نووسین و بەرهەمی تری گەردییەوە، شارەزای کۆن و کەلەبەر و تێپەڕینی ڕۆژگار و سەردەمەکانی زمانی کوردی ببین.



# ەزیز گەردی و جووتسەردەمی لە نووسیندا

## سەرنجێکی کورت

زاموا محەمەد

١

مێژووی نوێی نووسینی کوردیی ناوەڕاست چەند ناوێکی تێدایە، سەرباری توانا و گرنگی و درەوشانەوەیان، بەرپرسیارێتییەکی قووڵیشیان بەرامبەر بە قۆناغی خۆیان و پێش خۆیان هەبووە، بە ڕادەیەک کە دەستبەرداری هیچیان نەبوون و هەوڵیان داوە لە هەردوو قۆناغدا هەبن، یان بنووسن.

ئەم بەرپرسیارێتییە بەرامبەر بە دوو قۆناغ، لەو دەستەواژەیەدا کورت ناکرێتەوە کە بۆ نموونە عەرەب، بۆ نووسەرێکی بەکار دەهێنن دوو سەردەمی دیبێت (موخەزرەم)، بەڵکو پرسەکە دەپەڕێتەوە بۆ بەرهەمهێنان و نووسین لە دوو سەردەمی مەعریفیی جیای هەمان بواردا؛ واتە ئەوەی تۆ لە ڕێککەوتێکی دیاریکراوی ناو کاتدا بژیت، بەڵام لە دوو سەردەمی جیادا و بە دوو هۆشیاریی جیاوە، لە دوو قۆناغی مەعریفیدا بنووسیت. (هەڵبەتە لە هەندێک نووسەری ترماندا، قۆناغێکی تر کە دوای ئەمە بێت، لەیەکدانی ئەم دوو هۆشیارییەی سەر بەو دوو ئەبیستمە جیاوازەیە لە یەک گوتار و فۆرمدا، باسێک کە من نیازم نییە لێرەدا نزیکی ببمەوە).

٢

جیاوازیی نووسەرێک کە دوو سەردەمی دیوە، لەگەڵ نووسەرێکدا کە بە هۆشیارییەوە لە دوو سەردەمی جیادا (ڕابوردوو و ئێستا) دەنووسێت، دەکرێت بە نموونەی دوو شاعیری بەهێزی کوردیی ناوەڕاست ڕوون بکرێتەوە: هێمن و گۆران.

سەرنجێکی ئاشکرا و زانراوە لە بارەی هێمن موکریانییەوە، کە شاعیرێکە دوو سەردەمی دیوە، بە ڕادەیەک هەم گوتار و هەم فۆرمی شیعریی هێمن دەکرێت وەک شایەتییەک وەربگیرێن بۆ ئاوابوونی سەردەمێکی شیعری/ مەعریفی و دەرکەوتنی سەردەمێکی دیکەی شیعری/ مەعریفی.

بەو پێیەی ئەم نووسینە کورتە بۆ ئەم باسە تەرخان نییە، هەوڵ دەدەم تەنیا بە یەک بەیتی هێمن پرسەکە ڕوون بکەمەوە و تێی بپەڕێنم: "هەتا پشتم کۆمتر دەبێ پتر هەڵدەکشێ مینیژۆپ/ ئیتر دەستم بە داوێنی کچی ئەم شارە ڕاناگا".

"داوێن" دەستەواژەیەکە لە دیوانی سەرجەم شاعیرانی پێش هێمندا ئامادەگییەکی زەقی هەیە، بە ڕادەیەک کە بە گەڕانەوە بۆ مێژووی شیعری کوردیی ناوەڕاست، دەتوانین کەشکۆڵ بە کەشکۆڵ و بەیاز بە بەیاز، تا یەکەمین ئەدیبی ناوچەکە بڕۆین: "داوێنی پاکی مەداری دائیرەی خامەک نییە/ خوێنی مەقتوولانە وا داوێنی یاری گرتووە" (نالی). لە لایەکی دیکەوە، "مینیژۆپ"، یان تەنوورەی کورتی فەرەنسی، ئەگەر هێمن یەکەمین نووسەر نەبێت بیباتە نێو بواری شیعرییەوە، ئەوا بەرچاوترین و لە ڕیزی لەپێشینترینەکاندایە.

لە شیعری کوردیدا "داوێن" دەستەواژەیەکی تەواو میتافیزیکییە؛ بە دەگمەن وەک خۆی دەنوێنرێتەوە، چونکە بەردەوام لە نێوان دابەشکردنەکانی باشە و خراپەدایە، بەردەوام لە سەرەوە دانراوە و خودی شیعری لە خوارەوە سەیری دەکات، بۆیە خاوەنداوێن -یان یار- لە کلاسیکدا بەردەوام دەبرێتە پلەی سەروو مرۆڤ، چونکە داوێن "پاکی مەدار" نییە بۆ دائیرەی خامەک، بەڵکو ڕەنگەکەی هی "خوێنی مەقتوولانە" کە یار بەردەوام لەناویان دەبات، ئەگەر بێتو کۆک بین لەگەڵ ڕاڤەکەی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕڕیسدا (ئەم حاڵەتە لە مەحویدا دەگاتە لوتکە).

بەڵام "مینیژۆپ" دەستەواژەیەکی تەواو دونیاییە و تەنیا بە ئامادەبوونی ئەم وشەیە، بەرکارەکە -یار- دەبێتەوە بە مرۆڤ.

کەواتە گوتاری بەیتەکەی هێمن بەم جۆرەی لێ دێت: تا سەردەمەکە تێبپەڕێت و شاعیر پشتی کۆمتر

ببێتەوە، یار زیاتر دەبێت بە مرۆڤ و لە دامێنی پاک -یان خوێناوی- دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە سەردەمی مێنێژۆپەوە، سەردەمێک کە تێیدا شاعیر ئیدی دەستی کورتە و بە دامێن ناگات. ڕوونە هێمن کە لە سەردەمی دامێنەوە هاتووە، تەنیا بەشی ئەوەی زەمەن پێماوە سەیری کورتبوونەوەی مێنێژۆپ بکات، نەک دەستی بۆ درێژ بکات؛ بە دەربڕینێکی تر، هێمن بازنەی بەستنەوەی دوو سەردەمەکەیە پێکەوە، بۆیە ئیدی هیچیان نییە، نەک هەردووکیان بێت. هەر لە ڕێی ئەم "هیچیان نەبوون"ەشەوەیە، کە هێمن دوو سەردەمە شیعرییەکە بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

٣

عەبدوڵڵا گۆران حاڵەتێکە جیاواز لەمەی پێشتر باس کرا. وەرچەرخان لە کێشی عەرووزییەوە بۆ پەنجە، هەنگاوێکە تێیدا گۆران لە ئافەرینەکانی ڕەخنەی تەقلیدیی ناو ڕۆشنبیریی ئێمەدا پشکی شێری بەرکەوتووە، بەڵام ئەوەی فەرامۆشکراوە، ئەوەیە لەپاڵ کێشی پەنجەدا، گۆران هەرگیز دەستبەرداری عەرووز نەبووە (بگرە باشترین دەقەکانی ئەم شاعیرە، بەشێکی بەرچاویان لە عەرووزدا نووسراون). ڕاستە "پاییز"ەکەی گۆران ڕۆمانتیکیایەکی قەشەنگە لەسەر کێشی پەنجە، کەچی "کڵاولار"ەکەشی سەرباری ئەوەی غەزەلێکە لە عەرووزدا، بەڵام بە چەندین پێوەر سەر بەو بوارە شیعرییە نییە کە بۆ نموونە نالی، وەفایی یان سالم تێیاندا دەنووسی.

گۆران شاعیرێک بوو لە سەردەمی پاش تەواوبوونی کلاسیکدا، بەڵام بە دوو دەنگ و دوو هۆشیارییەوە لە هەردوو سەردەمەکەدا دەینووسی، بەو پێیەی عەرووز خاڵی بنەڕەتیی سەردەمی شیعریی پێشووە، وەلانانیشی خاڵی بنەڕەتیی سەردەمەکەی دواترە.

لە وەرگێڕانی گۆراندا ئەمە زەقتر دەبێتەوە: لە لایەکەوە ئەم شاعیرە، سەرباری ئەوەی نوێیە و وەک دونیابینی، لەودیو سەردەمی دەریاکانی ڕەمەل و هەزەج و موتەقارەبەوەیە، لە عەرووزدا دەنووسێت و ئەم دەریایانە وەلانانێت، لە لایەکی دیکەشەوە ئۆسکار وایەڵد و نازم حیکمەت وەردەگێڕێت. واتە گۆرانی عەرووزی، هەم پردە بەرەو کۆنترین سرووت و جادووی شاعیرانی پێش خۆی، کە عەرووز بووە، هەمیش دەروازەیە بە ڕووی دوو پانتایی تەواو نوێی وەک وایەڵد و حیکمەتدا.

ئەم دوو جۆرەی شاهەدەت لە نێوان دوو سەردەمدا، کە گۆران و هێمن وەک نموونەیان هێنرانەوە، بڕیار نییە هیچیان لە هیچیان باشتر بێت و فەزڵی یەکێکیان بدرێت بەسەر ئەوی دیکەدا، بەڵام جیاکارییەک بوو کە بۆ خستنەڕووی شوێنی عەزیز گەردی -بەو پێیەی نووسینەکە، دواجار، لە بارەی ئەوەوەیە- دەبوا ڕوون بکرێتەوە.

٤

گەر بێتو لە من بپرسن عەزیز گەردی سەر بە کام جۆرەی نووسەرانی جووتسەردەمە، ئەوا بێ دوودڵی و ڕاستەوخۆ دەڵێم سەر بەو جۆرەیە کە گۆرانم بە نموونەی هێنایەوە، واتە سەر بەو جۆرەی لە دوو سەردەمی جیادا دەنووسن، نەک ئەو جۆرەی دوو سەردەمی جیا پێکەوە دەبەستنەوە و دەبنە خاڵێک بۆ ئاوابوونی خۆرێکی مەعریفی و هەڵهاتنی خۆرێکی تر (وەک هێمن).

لە ئەزموونی گەردی-دا، بێگومان خاڵی بەهێزی ئەوە نییە کتێبی زۆری وەرگێڕابێت، بەڵکو ئەوەیە بە دوو هۆشیاریی جیا و لە دوو پانتایی جیادا، ئەم پیاوە بەرهەمی هەبوو. بە تایبەتی بۆ منێک کە ڕۆژگارێک لە جێیەکی تەواو دوور لەمرۆوە و لە عەرووزەوە دەستم پێ کرد، گەردی دەروازە بوو بۆ بوارێک زۆر دوور لە وەرگێڕانی ئەدەبی مۆدێرن و کلاسیکیاتی جیهانییەوە.

تا ماوەیەکی زۆر، لای خەڵکێکی زۆر، عەزیز گەردی وەرگێڕێک بوو فالاچی و تۆڵستۆی و بێڤچینکۆی بۆ خوێنەران دەکردە کوردی، بۆ منیش لە ڕیزی ئەو



لێکۆڵەرە زۆر دەگمەنانەدا بوو کە خۆیان دەدەن لە ئاڵۆزترین بواری توێژینەوە کوردییەکان: کێشناسیی کلاسیکی کوردی.
لەوسادا فێربوونی ئاهەنگەکانی عەرووز، بازنەکانی عەرووز، دەریاکانی عەرووز و پێچوپەنا بنبڕانەوەکانی عەرووز، وەک سیستمێکی دەنگیی لە بنەڕەتدا عەرەبی، بۆ منێکی منداڵ و تا بڵێیت تازەپیاکەوتوو، سەرباری ئەستەمییەکەی، هێشتا ڕێی هەبوو و هەنگاو بە هەنگاو، لە ڕێی فەراهیدی و عەرووزییەکانی دیکە و چەندین لێکۆڵەری عەرەبەوە، با بڵێین چووەسەر؛ بەڵام تێگەیشتن لە هەموو ئەو گۆڕانکاری، دەستکاری و نوێگەرییەی کوردەکان لەپێناو گونجاندنی سیستمی عەرووزی لەگەڵ فۆنەتیکی کوردیدا ناچاربوون بیانکەن، مەحاڵ دەبوو بەبێ چەند ناوێکی وەک نامی (عەبدولکەریمی مودەڕیس) و هەردی و عەزیز گەردی؛ ئەوەی بۆچی نالی هێندە بە نووسین لە دەریای هەزەجدا ئاسوودەیە، ئەوەی بۆچی کوردی فلان "وەتەد" لادەبات و فیسار "سەبەب" دەگۆڕێت، ئەوەی چۆنچۆنی خانی کێشێکی تر بۆ زەریایەکی عەرووز زیاد دەکات، بەبێ دەستگیرۆیی "کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی"، "ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی" و "کێشناسیی کوردی"ـەکەی گەردی و چەندین کتێبی لێکۆڵەرانی دیکە، تێگەیشتنی بۆ من مەحاڵ دەبوو؛ دڵنیام بۆ زۆر کەسی دیکەش مەحاڵ دەبوو.
بۆیە عەزیز گەردی، ئەگەرچی بە وەرگێڕانەکانی، دەروازەیەک بوو بە ڕووی ئەدەبی نوێ و کلاسیکیاتی جیهانیدا؛ هاوکاتیش بە لێکۆڵینەوە و نووسینەکانی، پردێک بوو بەرەو سەردەمێکی کۆن و تێپەڕیو، کە بەبێ لێکۆڵینەوەی وردی، بەبێ تێگەیشتن و خوێندنەوەی وردی، مەحاڵە هیچ داهێنان و خوڵقاندنێک بهێنرێتە ئاراوە.



# تەڵاقدان

**زەکەریا تامر**

**وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عەزیز گەردی**

ژنێکی بەرگڕەش چووە گۆڕستان، لەو کاتەدا، خۆری نیوەڕۆ خەڵکی ناچار کردبوو لەبەر هاڵاوی گەرما، خۆیان لە ماڵەوە و قاوەخانەی فێنک بنێن. پیاوێکی قەڵەوی قوتە و ڕووگرژ کەوتە دوایەوە. دیتی ژنەکە بەناو گۆڕەکاندا ڕۆیشت، لای گۆڕێک وەستا و لەسەر چیچکان دانیشت. پشتی کووڕ کردەوە و سەری شۆڕ کردەوە. کابرا بە هەشتاوی خۆی گەیاندێ و لێی پرسی گوتی: "ئەوە چ دەکەی؟"

ژنە هۆپەیەکی لە خۆی زانی. چاوەڕوانی پرسیاری وای نەدەکرد. بە شڵەژاوی گوتی: "هاتوومەتە سەردانی مێردەکەم."

کابرا بە گاڵتەجاڕی سەیری دەوروبەری خۆی کرد و لێی پرسی: "مێردەکەت لە کوێیە؟"

ژنەکە قامکی بۆ یەکێک لە گۆڕەکان ڕاداشت.

کابرا لێی پرسی: "کەنگێ مردووە؟"

ژنەکە گوتی: "ساڵێکە."

کابرا وای پێشان دا بەزەیی پێیدا دێتەوە، گوتی: "یەک ساڵی تەواوە بێ مێردی؟ ئەشکەنجەیەکە لە تاقەتدا نییە!"

کابرا سەیری دەوروبەری خۆی کرد. گۆڕستان چۆڵ بوو، کەسی تێدا نەبوو. لەپڕ پەلاماری ژنەکەی دا و لە تەک گۆڕی مێردی بە عەردیدا دا. ژنە ویستی بقیژێنێ و هاوار بکا، بەڵام کابرا توند دەستی لەسەر دەمی دانا و بە دەستەکەی تر خەنجەری هەڵکێشا و لەسەر هەوکی دانا. ژنە گوێی لێ بوو کابرا گەفی لێ کرد و گوتی: "سەرت دەبڕم."

ژنە لێی پاڕایەوە، گوتی: "جلم مەدڕێنە، چۆن بە جلی دڕاو بچمەوە ماڵێ"

کابرا گوتی: "ئەوەی دەیدڕێنم کە لە جادە ڕۆیشتی، کەس نایبینێ."

مێردی ژنەکە تووڕە بوو. ژنەکەی هان دا تا دواهەناسە بەرگری بکا و بە بیری هێنایەوە ژنی بەشەرەف، ئەگەر وەک مەڕ سەری ببڕن، ڕادەست نابێ. وەڵامی ژنەکە هێنکە هێنکێکی ناسراو بوو، مێردی زۆر جار لە ژووری نوستن گوێی لێ ببوو. ژنە دەرفەتی نەبوو گوێ لە پیاوەکەی بگرێ کە بە تووڕەیی پێی گوت: "برۆ، تەلاقم دای."

**سەرچاوە:** بەرسیلە (کۆمەڵە کورتەچیرۆک)، زەکەریا تامر، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١٩.

